# مامۆستای سەرکەوتوو

## لە کەسایەتی و کاری پیشەیی دا

نووسینی

م. حيدر محمد

هەولێر ٢٠١١ زاینی ـــــــــــــــــــــــــــــ ١٤٣٢کۆچی

بەناوی خودای گەورە و میهرەبان

**پێناسی ئەم پەرتووکە**

**★ناوی پەرتووك: مامۆستای سەرکەوتوو لە کەسایەتی و کاری پیشەیی دا**

**★نـووسـینی: حیدر محمد**

**★دیــزایـن: سەرکەوت بالیسانی**

**★دارشتنی بەرگ: زانا احمد**

**★نۆرەی چــاپ: چاپی یەکەم ٢٠١١**

**★تــیراژ: ١٠٠٠ دانە**

**چاپ :چاپخانەی منارە- هەولێر** (٠٧٥٠٤٤٥٦٢٩٧)

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٩٢١)ی ساڵی ٢٠١١ پێدراوە**

# پێشکەشە:

- بە دایك  و باوکم.
- بە هەموو ئەو ماموٚستایانەی فێریان کردم.
- بە هەموو ئەو ماموٚستایانەی دڵسوٚزانە لە سەنگەری  پەروەردە و فێرکردن تێدەکوٚشن.

# پێشەکی

پرۆسەی پەروەردە وفێرکردن، جیا لە هەموو لایەنەکانی تری ژیان، بە ئالۆزترین و گرنگترین پرۆسەکانی ژیان دادەنرێت، چونکە لەلایەك پەیوەندی بە خودی تاکی کۆمەڵگەوە هەیە، لەلایەکی تر، خاڵی یەکەمی دەست پێکردنی بەرەوپێشچوون و گەشەکردن و بنیاد نانی ژیار و شارستانیەتە، ئەگەر بمانەوێت خۆمان و میللەتەکەمان بەرەو پێش ببەین، دەبێت لەناو قوتابخانەوە دەست پێ بکەین، لە قوتابخانەکانیش، پێویستە نەخشە و پلانەکان لە قۆناغی باخچەی ساوایانەوە دەست پێبکات. یەکێك لە پایە هەرە گرنگەکانی قوتابخانەش بوونی مامۆستای کارامە و سەرکەوتووە، ئەگەر کەم و کوڕی لەم لایەنەدا هەبوو، ئەوا ناتوانین هەنگاوەکانمان دەست پێبکەین، وولاتی یابان بە مانگێك دوای کارەساتی هێرۆشیما، قوتابخانەکانی خۆی لەسەر پاشماوەی خۆڵ و زبری کارەساتەکە دامەزراندەوەو ژیان و کەسایەتی مامۆستای بۆ بەرزترین ئاست بەرزکردەوە، هەر بۆیە بەماوەیەکی کورت شۆڕشی زانست و تەکنەلۆژیای بەرپاکرد و هاتە ریزی وڵاتە هەرە پێشکەوتووەکانی جیهان. لەناو ئێمەی کورد، تاوەکو ئێستا نەمانتوانیوە خۆمان لە کۆسپ و قەیرانەکانی پەروەردە و فێرکردن رزگار بکەین و هەنگاو بەرەو پێشکەوتن بهاوێژین، لەبەر ئەوە ئێمە لەهەموو کەس زیاتر پێویستمان بە نەخشەکێشان و دانانی بەرنامە و نووسینی بابەت هەیە، تاوەکو کۆسپەکانی بەردەممان بشکێنین. نووسین لەسەر پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن لە هەموو بوارەکان، بەبێ جیاوازی، بەزمانی شیرینی کوردی زۆر کەمە، بەتایبەتی ئەگەر لە چوارچێوەی کتێب

یــان لێکۆلینەوەیــەکی زانسـتی دا بێـت. بۆیــە کـاتی ئــەوە هـاتووە بــە هــەموو لایەکمان ئەم کەلێنە پربکەینەوە و پەرە بەم بوارە بدەین.

مــن وەك مامۆسـتایەك ئــەو تێبینــی و دەرەنجامانــەی کــە لــە مــاوەی دوانــزە سـاڵی کـارکردنم لـەناو ناوەنـدەکانی خوێنـد، فێریـان بـووم و تۆمـارم کــردوون، لەگــەڵ ئــەو شـتانەی خوێندوومەتــەوە و سـودم لێ وەرگرتــوون، بــە پێویستم زانی  بیانخەمە بەردەستی مامۆستایانی بەڕێزەوە، بـە تێکـەڵ کردنـی لەگــەڵ زانیــاری ســەردەم، تــاوەکو ببێتــە سەرچــاوەیەکی بچــووك لــەپاڵ سەرچاوەکانی تر کـە مامۆسـتایانی پـێش خۆمـان نووسـیویانە و خسـتوویانەتە بەردەسـتی ئێمــە. بـۆ نووسـینی ئــەم پەرتووکــە گــەڕاوم بــەناو زۆربــەی ئــەو پــەرتووك و رۆژنامــە و گۆڤارانــەی کــە بــەزمانی کـوردی لەسـەر ئـەم بابەتـە نووسـیویانە، لەگــەڵ سـوود وەرگــرتن لــە سەرچـاوە عەرەبیــەکان و پێگــەی ئەنتەرنێت و یانەکان.

زۆر لە مامۆسـتایان پـۆل بـە گۆڕەپـانی جـەنگ دەچـووێنن، رۆژانـە چـەندان کێشە و گرفـت  لـەناو قوتابخانـە رووبـەڕووی مامۆسـتا دەبنـەوە، نەخوێنـدن و بێتاقەتی و دیـاردەی قۆپیـەکردن و هەڕەشـەکردن و تێکچـوونی ئـارامی پـۆل و گوێ نەگرتن بۆ بەرامبەر و هێنانی ئامێری تەلەفۆن و وێنـەگرتن بـۆ پۆلـەکان و دەوام نــەکردن و غیابـاتی زۆر و ریزنــەگرتنی یــەکترو چــەندان کێشــەی تــر، بوونەتــە بەربەسـت لەبــەردەم مامۆسـتا، وایــانکردووە پرۆســەی پــەروەردە و فێرکــردن ناشــرین و لەکــەدار بێــت، لەلایــەکی تریشــەوە خــودی مامۆســتای بێتاقەت کردووە. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە کە مـرۆڤ نابێـت خـۆی بـدات بـە دەستەوە، هەروەها ناشـکرێت هۆکـاری سـەرهەڵدانی هـەموو دیاردەکـان بخەینـە

ئەستۆی تەنها یەك لایەن و یەك کەس، بەڵکو هەمووومان ئەوانەی لەناو پرۆسەکەداین(حکومەت، وەزارەت، بەرێوەبەرایەتیەکان، بەرێوەبەرەکان، مامۆستایان، قوتابیان، دایك وباوکان) بەشێك لەو کەم و کورپیانەمان دەکەوێتە سەر شان کە ئەمرۆ توشی هاتووین، هەربۆیە پێویستە دانی پێدابنێین و هەوڵی گۆڕانکاری بدەین، ئێمە وەك مامۆستا سەرەتا دەبێت لە خۆمانەوە دەست پێبکەین و ئەنجا بۆ بەرامبەر. ئەمەش بە خۆ رۆشنبیرکردن خۆپرزانستکردن دەبێت، بە گەرانەوە بۆ هەموو ئەو نووسراوە زانستیانەی سەردەم و وەرگرتنی تاقیکارییەکانی رابردوو، کەمامۆستایانی پێش ئێمە پێی گەیشتوون.

ئەم پەرتووکە باس لە مامۆستای سەرکەوتوو دەکات کە چۆن بتوانێت بە راستترین و زانستیترین رێگا، هەوڵی خۆی بدات و لە بەجێگەیاندنی ئەم ئەرکە پیرۆزە سەرکەوتن بەدەست بهێنێت.

# پانزه بنەمای گرنگ

١- هانی قوتابیەکەت بدە کاتێك کارێکی چاك ئەنجام دەدات، رێگای زیاتری بۆ رۆشن بکەوە.

٢- رێزی قوتابیەکەت بگرە، ئەگەر دەتەوێت رێزی تۆ بگرێت.

٣- بە گفتوگۆ و قسە لەگەڵ کردن قوتابی فێربکە، کاتێك پێویستیەکی هەبوو داوا لە تۆ بکات، تۆش بۆی جێ بەجێ بکە.

٤- هاوار بەسەر قوتابی دا مەکە و بەسەریدا هەڵمەشاخە.

٥- بە شتێك قوتابی مەترسێنە کە دەسەلآتت بەسەردا نیە و ناتوانیت جێ بەجێ ی بکەیت.

٦- هەمیشە کاری ئاسان و رێگای ئاسان و پرسیاری ئاسان ئاراستەی قوتابیەکەت بکە، خۆت لە شتی ئاڵۆز و گران بە دوور بگرە.

٧- رێگا بۆ هاتنە پێشەوەی یەکە یەکەی قوتابیەکان خۆش بکە ، هیچ کامێکیان پشت گوێ مەخە.

٨- هەمیشە رقت لە کردەوەی ناشرین ببێتەوە نەك کەسەکە خۆی.

٩- بەخۆشترین ناو بانگی قوتابیەکەت بکە.

١٠- لێبوردەییت زۆر بێت و سنورێکی فراوان بۆ قوتابیەکەت دابین بکە، بۆ ئەوەی هەڵەکانی چاك بکاتەوە.

١١- هەمیشە وا سەیری قوتابیەکەت بکە کە بە توانا و بەهێزە، گومانی خراپی بۆ هەڵمەبەستە.

١٢- قسەیەك بۆ قوتابیەکەت مەکە کە خۆت بەکردەوە نەت کردبێ، داوای فێربوونی شتێك لە قوتابی مەکە کە خۆت نایزانی.

١٣- بەردەوام خۆشەویستی و گرنگی پێدانی خۆت بۆ قوتابیان دووبارە بکەوە.

١٤- هەرگیز پشت لە ئامۆژگاری قوتابیان مەکە، چونکە قوتابی لە ئاو زیاتر پێویستی بە ئامۆژگارییە.

١٥- بە سەلام کردن و رووی خۆش یەکەم چرکەی رووبەروو بوونەوەت لەگەڵ قوتابی دەست پێبکە.

# بەشی یەکەم

## لایەنە گرنگەکانی کەسایەتی مامۆستای سەرکەوتوو

مامۆستا پایەیەکە لە پایە هەرە گرنگەکانی سەرکەوتنی پڕۆسەی پەروەردە و فێرکردن، ئامادەکردنی مامۆستای بەتوانا و لێهاتوو، خۆری ئاسۆ هەڵدێنێ و مژدەی سەرکەوتنمان بە گوێدا دەدات. بەپێچەوانەوە، لاوازی کەسایەتی مامۆستا و نزمی ئاستی پەروەردەیی و زانستی، هەنگاوەکانی پێشکەوتن رادەگرێت و بەربەستێکی گەورە پەیدا دەبێت لەبەردەم بە ئەنجام گەیاندنی ئەم پڕۆسەیە. ئەوانەی بیر لە پێشکەوتن دەکەنەوە، سەرەتا لەمامۆستاوە دەست پێدەکەن، کەسایەتی مامۆستا جیاوازییەکی زۆری هەیە لەگەڵ کەسایەتیەکانی خاوەن پیشەکانی تر، چونکە ئەو پەروەرشیارە، پێشەواو رابەرە، بنیادنەری کەسایەتی مرۆڤە، ئامادەکاری مرۆڤی سودبەخشە بۆ داهاتوو، بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەم ئەرکە پیرۆزە، پێویستە لە زۆر لایەنەوە مامۆستا خاوەنی کەسایەتیەکی تەواوبێت، زانایانی بواری پەروەردە ئاماژە بە زۆرێك لەو لایەنانە دەکەن کە پێویستە لە کەسایەتی مامۆستادا هەبێت، بۆ ئەوەی بتوانێت بە ئاسانی و بەبێ کێشە و گرفت سەرکەوتن لە پیشەکەیدا بە دەست بهێنێت.

# یەکەم/ لایەنی رەوشت

**١- ئامانج لە کارکردن.**

ئەرکی سەرەکی مامۆستا، فێرکردنی قوتابی و پێگەیاندنی مرۆڤی دەست پاك و خزمەتگوزار و زانستخوازە، هەمیشە دەبێت ئەم ئامانجە گەورەیە لەبەرچاو بگیرێت، لەم ئاستە بەرزەوە بۆ پیشەکە بڕوانرێت، شتی لاوەکی نەکرێتە ئامانجی سەرەکی، وەکو بیرکردنەوە لە مووچە و بەدەست هێنانی پلە و پایە و چەندان شتی تر، بۆ ئەوەی لە داهاتوو سودی بۆ خۆی بە تایبەتی، خاك و خەڵك و نیشتمانەکەی بەگشتی هەبێت، دەبێت مەبەستەکانی تر وەلاوە بنرێت، خۆی لێ دوور بخرێتەوە، ئەگەر مامۆستا بۆ ئەم ئامانجە گەورەیە کاربکات، ئەوا هیچ هۆکارێکی خودی و دەرەکی کاری تێناکات، بێزار نابێت و ڕقی لە پیشەکەی نابێتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، هەرچەندە ژیان ناخۆش بێت و هۆکاری بێزارکەر دەوری بدەن، بەلاّم ئەو بە حەماسەتێکی زۆرترەوە بەر لە شالاّوی نەفامی دەگرێت و چۆك دانادات.

**٢- هەست بە بەرپرسیاریەتی کردن.**

هەروەك چۆن دایك و باوك خەمی گەورە کردنی منداڵەکانیەتی، فەرمانبەر خەمی ڕاپەڕاندنی کارەکەیەتی، پۆلیس خەمی کەمکردنەوەی تاوان و سەرپێچی یەکانە، مامۆستاش دەبێت خۆی بە بەرپرس بزانێت لە داهاتووی ئەو هەموو قوتابیەی کە لە ژێر دەستی دایە، هەست بەو بەرپرسیاریەتیە

گەورەیە بکات، دەبێت بزانێت لە قوتابخانەوە ژیان دروست دەبێت، لە ژێر دەستی ئەوەوە تاکەکان ئاراستەی ناو کۆمەڵگا دەکرێن، ئەگەر پیشەکانی تر لە تەنها لایەنێکی کۆمەڵگا بەرپرسیار بن، ئەوا مامۆستا بەرپرسیاری یەکەمی هەموو تاکێکی کۆمەڵگایە، دەتوانێت بە هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی خۆی، ژیانێکی ئارام و پڕ لە زانست و زانیاری دروست بکات، بە پێچەوانەشەوە کەمتەرخەمی کردن و لاواز بوونی هەستی بەرپرسیاری، کۆمەڵگا بەرەو نەزانی و نەفامی دەبات، بەمەش رێژەی تاوان و لادان لەناو کۆمەڵگا روو لە زیادبوون دەبێت، لێکۆڵینەوە زانستیەکان ئەوەیان سەلماندووە کە ئەو کۆمەڵگایانەی رێژەی تاوان و گەندەڵیان لە ئاستێکی بەرز دایە، هۆکاری یەکەمی دەگەڕێتەوە بۆ بەرزی رێژەی نەخوێندەواری، باشترین رێگاش بۆ بەرگرتن لە دیاردەی نەخوێندەواری، دروست کردنی ئەو هەست بە بەرپرسیاریەتەیە کە پێویستە مامۆستا بۆ خۆی دروستی بکات.

٣- **هێمنی و پەلەنەکردن**.

پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن یەکێکە لە ئاڵۆزترین پرۆسەکانی ژیان، پڕیەتی لە کێشە و چەرمەسەری، پڕیەتی لە هۆکاری بێزارکەر، بەقەد گەورەیی و پیرۆزی کارەکە، ئاستەنگ و لەمپەرەکان زۆرن، بەڵام بەرهەمەکەی شیرین و بە چێژ و دڵخۆشکەرە، بۆیە لە هەموو کەسێك زیاتر مامۆستا پێویستی بە هێمنی و خۆگری هەیە لەبەرامبەر ئەو لێشاوە گرفت و کێشانەی کە رووبەرووی دەبنەوە، پەلە نەکردن لە گەیاندنی پەیامەکە و چاوەنواربوون تاوەکو قوتابی فێردەبێت، خاڵێکی گرنگی بەرزی رەوشتی مامۆستایەتیە، وەکو ئەو جوتیارەی کە زەوی جوان دەکێڵێت و بژاری دەکات و تۆی پێوە دەکات،

پاشان لە چاوەنواریدا دەبێت تاوەکو پێدەگات و شیندەبێت و بەرهەم دەدات.

فێربوونی کەسێك لە ئەلفەوە بۆ یا ، هەم پێویستی بە کاتێکی درێژخایەن هەیە، هەمیش پێویستی بە ئارامییەکی زۆر هەیە، بەلاّم دەبێت ئەوەش بزانین کە بەرهەمەکەی شیرین و دڵخۆشکەرە وپاداشتێکی گەورەی لە دواوەیە.

**٤- دڵسۆزی.**

ئەرکی ماموستا لە هەموو ئەرکەکانی تر پیرۆزتر و بەڕێزترە، هەر بۆیە پێویستە ماموستا زۆر ئاگاداری ئەوە بێت کە هەوڵبدات بۆ فێرکردنی تەواوی قوتابیەکانی، جیاوازی نەکات لە نێوان هیچ یەکێك لە قوتابیەکان، ئاراستە کردنی زیرەکەکان و بردنیان بەرەو ئامانجێکی روون، لە هەمان کاتدا بەرەو پێشبردنی ئاست نزمەکان و زیاتر خۆخەریکردن پێیانەوە، بە شێوەیەك نابێت ماموستا تەنها یەك قوتابیش پشت گوێ بخات. جا ئەم پشت گوێ خستنە بەهەر هۆیەکەوە بێت، بەڵکو لەسەریەتی هەوڵ بدات ئاستی سەرجەم قوتابیان لەیەکتر نزیك بکاتەوە و دڵسۆزی خۆی بۆیان دەربخات، ئەم هەولاّنەشی نابێت لەسەر حیسابی هیچ یەك لە قوتابیەکان بێت.

خستنەڕووی تەواوی هێز و توانای ژیری و جەستەیی لەلایەن ماموستا، نیشانەی بوونی دڵسۆزییە، دوور کەوتنەوە لە خۆخەریك کردن بەکاری دەرەوە و نەهێنانی کاری ماڵەوە بۆناو قوتابخانە. کاریگەر نەبوون بەهیچ قسە و هەڵوێستێك کە لەبەرامبەری ئەنجام دەدرێت، گرینگی دان بە بەشێك و پشتگوێ خستنی بەشێکی تری قوتابیان، کارێکی ناپەروەردەییە، ماموستا کاتێك لە قوتابخانەیە مولکی قوتابیە، ئەو رۆژە دەبێت تەواوی توانای خۆی بۆ فێرکردنی قوتابیان بەکاربهێنێت، نابێت بۆ هیچ کارێکی تر ئەو کاتە

لە قوتابیان بە فێرۆبدات و خۆی بەکاری لاوەکی خەریك بکات.

٥- **خاکی بوون**.

پەروەرشیاری سەرکەوتوو هیچ کات شانازی بەو زیرەکی و لێهاتووەی خۆی لەبەردەم قوتابیان ناکات، نازیان بەسەر نافرۆشێت و خۆ بەگەورەزان نیە، کەسایەتی قوتابی ناشکێنێت و دەروونیان ئازار نادات، وەکو مرۆڤ رێزیان دەگرێت و هەڵس و کەوتیان لەگەڵ دەکات، لە ژوورەوە باسی مێژووی رابردووی خۆی ناکات و داستان و سەروەریەکانی خۆی ناکاتە بابەتی ناو پۆل، لە ناخەوە خۆی بەخزمەتکار دەزانێت و چاوەنواری سوپاسگوزاری ناکات، چونکە دەزانێت ئەم جۆرە کارانە هی مرۆڤی نەزان و نا رۆشنبیرە، بەدەربڕینی ئەمانەی سەرەوە پلە و پایە و رێز و شکۆی دادەبەزێت، بەرەکەت لە فێربوون نامێنێ، ئەوانەی لە پۆلدا خەریکی باسکردنی خۆیانن لە ناخەوە هەست بە کەم و کوڕی خۆیان دەکەن، بە کردەوە ناتوانن خۆیان وەك مامۆستایەکی سەرکەوتوو نیشان بدەن، بۆیە پەنا بۆ ناساندنی خۆیان دەبەن لەلایەن خۆیانەوە، ئەگەر مرۆڤ ئەرکی خۆی بەبێ کەم و کوڕی ئەنجامدا، دڵسۆز و خەمخۆر و بەخشندە بوو، بە گوێرەی بەخشین و دڵسۆزی خۆی رێزی دەگیرێت و پلە و پایەی لەناو قوتابخانە و هەم لەناو کۆمەڵگا بەرز دەبێتەوە، نابێت مرۆڤ رێگا بەخۆی بدات بەهۆی زیرەکیەکەیەوە لە ژوورەوە خۆی بە گەورە بزانێت و بەرامبەرەکەی بە کەم و سووك سەیر بکات، چونکە بە دڵنیاییەوە هەڵوێستەکە پێچەوانە دەبێتەوە.

**٦- راستگۆیی.**

راستگۆیی لە قسەکردن و لە کردار و لە بەجێ گەیانـدنی پەیمانەکانـدا، پێویســتیەکی گرنگــی کەســایەتی مامۆســتایە، پیشــەی مامۆســتایەتی واتــا راستگۆیی، ئەگەر ئەم رەوشتە لە مامۆستا جیا کرایەوە، ئەوا هیچ پێناسەیەکی بۆ نامێنێتەوە، لەگەڵ ئەوەی هەمووومان پێویستە راستگۆ بین بەلام مامۆستا لە هەمووان زیاتر دەبێت راستگۆتربێت. پێغەمبەرمان (محمد) درودی خوای لەسەر بێت، پێش ئەوەی پەیامی خوایی بۆ بێت بە (راستگۆ ) ناسرابوو، ئەم راستگۆییە بووە هەوێنی سەرکەوتنی بانگەوازەکەی، هەر ئەم سەروەرەش فێرمان دەکات کە موسڵمان وەك مرۆڤ رێی تێدەچێت هەموو کارێکی هەڵە بکات، تەنها (درۆ) ناکات.

جێی خۆیەتی بە بیرخۆمان بهێنینەوە لە قوتابخانە چەند قسەمان کردووە و لەبیرمان کردووە، چەند پەیمانمان بە قوتابی داوە و نەمان بردوەتە سەر، چەند رێنمایی جوانمان ئاراستەی قوتابی کردووە و بەلام لە خۆماندا نیە، چەند پرسیارمان لێکراوە و بەڕاستی وەلامـمان نەداوەتەوە، ئەمانە و چەندانی تر کە پەیوەندیان بە کەسایەتی مامۆستاوە هەیە، بوونی کەم و کوڕی لەم لایەنەوە کەلێنێکی زۆر دەخاتە کەسایەتی مامۆستاوە.

**٧- بەڕێزی و هیممەت بەرزی.**

رێزگرتن لە کەسایەتی و بۆچوونەکانی قوتابی، گوێگرتن لە رەخنە و پێشنیارەکان، وەلامدانەوەی پرسیارەکانی، هەستێکی پۆزەتیڤانە دروست دەکات لای قوتابی، بەرامبەر بە مامۆستا، لە پۆلدا پرسیارم زۆر لە قوتابیان کردووە کە کام مامۆستاتان خۆش دەوێت؟ وەلامی زۆربەیان ئەوە بووە کە ئەو

مامۆستایەی ڕێزمان دەگرێت و گوێمان بۆ دەگرێت و پرسیارەکانمان وەڵام دەداتەوە، وەك برادەرێك لەگەڵمان دەژی. ئەم ئاکارە قوتابی رازیدەکات و بەرزی کەسایەتی مامۆستاش رادەگرێت.

مامۆستا هەمیشە هیممەت بەرزە، خەریکی پێگەیاندنی خۆیەتی، ئاستەنگەکان ساردی ناکەنەوە و بەرەو هەڵدێری نابەن، بەڵکو بە پێچەوانەوە، مامۆستای سەرکەوتوو ئاستەنگەکان دەکاتە پەیژە و پایە، بۆ گەیشتن بەسەرکەووتن و گەیشتن بە ئامانجەکانی، ئەمەش وا بەئاسانی نایەتە دی، بەڵکو بەردەوام پێویستی بە پێگەیاندنی خود و هاموشۆی زانایان هەیە، هەر وەك شێخی گەیلانی دەفەرمووێ( سيروا مع الهمم العاليه) لەگەل هیممەت بەرزان بە ڕێگادا بڕۆن، ئەوان دەبنە داینەمۆی بەردەوامی تۆ ، کەسانی تەمبەڵ و بێ هیممەت، دەبنە گەورەترین بەربەستن لەبەردەم بەردەوام بوونی تۆ، ساردت دەکەنەوە و لە ئامانجە راستەقینەکەی خۆت دوورت دەخەنەوە.

**٨- ڕووخۆشی و هەستی خۆشەویستی.**

خۆشویستنی وانەکە و ئەو پەیامەی هەڵیگرتووە، گەرم و گوڕی و نیشاندانی خۆشەویستی بۆ بەرامبەر، ڕووخۆشی و دەم بە خەندەیی ، بەردەوامی بە مامۆستا دەبەخشێت و سەرنجی قوتابی زیاتر بۆ خۆی کێش دەکات. کاتێك وانەم بە پۆلی دووەمی ناوەندی دەگووتەوە، قوتابییەکم هەبوو لەسەرجەم وانەکان زۆر زیرەك بوو، بەڵام لەوانەکەی من وەك پێویست نەبوو، ئاستی لەچاو وانەکانی تر نزم بوو، ویستم هۆکارەکە بزانم و چارەی بکەم، ڕۆژێك قوتابییەکەم بانگکرد و پرسیارم لێی کرد، گووتم: (کوڕی خۆم تۆ بۆچی لەسەرجەم وانەکان زیرەکیت، بەڵام لەوانەی من وەك پێویست نیت؟)،

گوتی: (مامۆستا راستیەکەی من حەزم لە وانەی تۆ نیە، چونکە تۆ منت خۆش ناوێت)، دوای نیو کاتژمێر قسەکردن، ئەو گرێیەم بۆ کردەوە و بۆم روون کردەوە کە من ئەوم خۆش دەوێت، چەند هەفتەیەکی نەبرد نمرەکانی وانەکەی من لەنمرەی  هەموو وانەکانی تر بەرزتر بوو، ئەمەش مانای وایە تاوەکو خۆشەویستی نەدەیت بە قوتابی ناتوانیت زانستی پێ بدەیت.

پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێت) وەك مامۆستایەك بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی، هەمیشە دەم بە خەندە بووە و رووی وەك مانگ گەشاوە بووە، هیچ کات ڕوو گرژو توڕە دەرنەکەوتووە، هەر ئەم  هۆکارەش بوو کە خەڵکی لەدەوری کۆبوونەتەوە و پەیامەکەیان لێ وەرگرتووە. زانایانی دەروونناسی دەریان خستتووە کە مرۆڤ هەر چەندە زیرەك بێت، بەڵام لەکاتی گەیاندنی زانست و زانیارییەکەی بۆ قوتابییەکانی رووگرژ وتوڕە و توند بێت، ئەوا تەنها (٢٠٪)ی زانیارییەکەی سودی دەبێت، (٨٠٪) کەی تر تەنها ماندوو بوون و بەفیڕۆ چوونی کاتەکەیەتی، خۆش ویستنی کارەکە و خۆش ویستنی قوتابیان و  روو خۆشی و دەم بەخەندەیی لە سیما گرنگەکانی مامۆستای سەرکەوتووە.

### ٩- نەرم و نیانی و سنگ فراوانی:

نهێنی سەرکەووتنی زۆربەی کارەکان نیشاندانی نەرم و نیانییە، بەتایبەتی بۆ پڕۆسەی فێرکردن خاڵێکی زۆر پێویستە، چونکە وەك پێغەمبەرمان دەفەرموێت:( **ان الرفق لا يكون في شيء الا زانه ولا ينزع من شيء الا شانه** )( رواه امام مسلم ) واتە نەرم و نیانی لە هەر شتێ هەبوو ئیللا جوانی دەکات، نەرم و نیانیش لە هەر شتێ دوورخرایەوە، ئەو شتە ناشرین دەبێت ، ئیمامی عەلی رەزای خوای لەسەر بێت دەفەرموێت:(دڵەکان وەك گیانداری

درِندە وان ، هەرکەسێ نـەرم و نیـانی بەرامبـەریان بنـوێنێ، ئـەوانیش نـەرم و نیان دەبن( **القلوب وحشية فمن تالفها اقبلت عليه** ).

زوو تـورِە نـەبوون و هەڵنەچـوون و سـنگ فراوانـی لـە پۆلـدا، دەرگـای سەرکەوتن لەبەردەم ماموّستا والآ دەکات و رەوشەکە بەرەو ئەو ئاراستەیە دەبات کە ماموّستا خۆی دەیەوێت. ساڵێکیان لە ئامـادەیی وانـەم دەگووتـەوە، پۆلێـك لـە پۆلەکان، کێشەی زۆریان هەبوو لەگەڵ ماموّستایان، هیچ ماموّسـتایەك نـەبوو کـە گلەیی لەو پۆلە نەبێ، دوای ئەوەی کە نزیکەی مانگێك وانەم بەو پۆلە گووتـەوە، رۆژێکیـان وانەکـە تـەواو ببـوو، تـەنها چـەند خولـەکێك مـابوو ، منـیش هەنـدێ تێبینیم توّمار دەکرد، لەو کاتە قوتابییەك هات و گووتی:(( ماموّسـتا دەزانـی تـۆ ماموّسـتایەکی زۆر باشـی؟!!) گـوتم بۆچـی؟!!، گـووتی:(ئێمـە ئەمسـاڵ هـەر ماموّستایەك هاتبێـت بـۆ لامـان تورِەمـان کـردووە و وانـەکـەمان پـێ وەسـتاندووە، بـەلآم ئـەوە مـاوەی مانگێکـە ئێمـە خـەریکین و ئـاژاوە دەکـەین و پـلان بـۆ تـۆ دادەنێین، تاوەکو تورِەت بکەین و دەرسەکەت بووەستێنین، بـەلآم تـۆ هـەر خـۆگر بوویـت و تـەنها بـۆ جارێکیش لـە ئێمـە تـورِە نـەبووی، بەرِاسـتی بەسـەر ئێمـەدا زاڵبوویت). پەیژەکانی سەرکەوتن دەورە دراون بـە کۆمـەڵێك کێشە پێویستە لـە بەرامبەریان نەرم و نیان و سنگ فراوان بین.

## ١٠- باوەرِبوون بە گفتوگۆ و دان وستان:

مرۆڤی سەرکەوتوو تەنها خۆی نابینێـت، تـەنها شـتەکانی خـۆی بەرِاسـت نازانێـت، تــەنها مافــەکانی خــۆی ناخوێنێتــەوە، بــەڵکو هەمیشــە بــەردەوام خـەڵکێکی زۆر لەبـەر دەمـی خـۆی دەبینێـت، هەسـت دەکـات ئـەمانیش مافیـان هەیـە و پێویسـتیان بەشـتە بـۆ ئـەوەی وەری بگـرن، بۆیـە بـەردەوام دەرگـای گفتوگۆی والآیـە و ئامـادەی دان و سـتانە لەگـەل بەرامبـەر، زۆر ماموّسـتا هـەن

کێشەی پۆلیان زۆرە ، هۆکارەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە تەنها لە پۆلدا خۆیان قسە دەکەن و گوێ بۆ داخوازی و داواکارییەکانی قوتابی ناکەنەوە، ئامادەنین ئەگەر تەنها بۆ چەند چرکەیەکیش بێت بوار بۆ قوتابی بڕەخسێنن و گفتوگۆ و دان و ستانی لەگەڵ ئەنجام بدەن، ئەم دەرگا داخستنە لە رووی قوتابی، لەلایەك دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی کێشە، لەلایەکی تر ئاستی وەرگرتنی زانیارییەکان لەلای قوتابی کز دەکات.

## ١١- دەم پاکی و هەڵسوکەوتی جوان:

ئێمە کە منداڵ بووین دوو دیاردەی زۆر زەق لە قوتابخانەکان بوونیان هەبوو، ئەوانیش بریتی بوون لە ( لێدان و جوێندان) لەلایەن مامۆستایانەوە. کە بە داخەوە ئەو دوو دیاردەیە بە هیچ شێوەیەك پەروەردەیی نین و لە هیچ وڵاتێکی پێشکەوتووی دونیا نیە ، لەهەرێمی کوردستان خۆشبەختانە بە یاسا لێدان قەدەغە کراوە، بەڵام دیاردەی جوێن دان هێشتا ماوە و بە ئاسانی هەستی پێدەکرێت ، زۆرێك لە مامۆستایان بە چەکێکی دەزانن بۆ بەرگری کردن لە خۆیان، هەشیانە بە هۆکارێکی پەروەردەیی دەزانێت. ئەگەر مامۆستا دەمی پیس بێت، هەڵسەکەوتی نەشیا و ناشرین بێت، جوێن بە قوتابی وماڵەوەی قوتابی بدات، ئەبێ چ جۆرە نەوەیەك بەرهەم بێت؟!!، ئیسلام فێری کردووین کە نابێ جوێن بە هیچ کەسێك بدرێت، تەنانەت ئەوانەشی کە هاوەڵ بۆ خوا دادەنێن، چونکە ئەوانیش دەرگای جوێندانیان بۆ والأ دەبێت تاوەکو جوێن بە خوا بدەن. ئەگەر بمانەوێت لە پۆلدا بەرگری لە خۆمان بکەین ئەوا رێگای زانستی و پەروەردەیی زۆرە، بە مەرجێ رۆشنبیریمان دەربارەی هەبێت و فێری بووبین، ئەو کات پەنا بۆ جوێن دان و هەڵسوکەوتی ناشرین نابەین.

# دووەم/ لایەنی پیشەیی

**١- خاوەن کەسایەتیەکی بەرز.**

ئەوانــــەی کـــاری پـــەروەردەکردنی مـــرۆڤ دەکـــەن پێویســـتیان بـــە کەسایەتیەکی بەرز هەیە، نموونە بن بۆ هەموو کەسێك، بـەلاَم دەبێـت بـزانین کەسایەتی بەرز چی یە؟. چ پێوەرێك بە کار بهێـنین بـۆ ئـەوەی بـە شـێوەیەکی زانستی لەو کەسایەتیە بگـەین کـە ئێمـە دەمانـەوێت، زۆر کـەسمان فیزکـردن و خۆ دوور گرتن و تێکەڵ نەبوون لەگـەڵ قوتـابی بـە کەسـایەتی دروسـتی خـۆی دادەنێت، کەسانی تر هەن ئەوەندە تێکەڵن لەگەڵ قوتابی هیچ جیاوازییـەکیان لـە نێـوان خۆیـان و قوتابیـان نـە هێشـتۆتەوە. ئـەم دوو جـۆرە بـە شـێك لـە زیادەرەویان تێدایە، لە هەر بارێکدا دەبێت ئەو راستیە بمێنێتەوە کە مامۆسـتا، مامۆستایە و قوتابیش قوتابیە. ئەو خالاَنەی کە کەسایەتی مامۆستا رادەگرن و بە هێزی دەکەن بریتین لە :

١- پڕزانستی و زاڵبوونی تەواو بەسەر وانەکە و رۆشنبیرییەکی بەرز.

٢- خۆسووك نەکردن و خۆ دوور گرتن لە گاڵتە و قسەی هـەزەلیاتی لـە رادە بەدەر.

٣- نەشاردنەوەی راستیەکان و گەیاندنی تەواوی زانیارییەکان بە قوتابی.

٤- دادپەروەری وجیاوازی نەکردن لە نێوان قوتابیان.

٥- راستگۆیی لە کردار و گوفتاردا.

٦- خۆ هەڵنە قولتاندن لە هەموو کارێك.

٧- رووخۆشی و بەشەوقەوە بوون بۆ گوتنەوەی وانەکە.

## ٢- پەراوی سەرکەوتن.

مرۆڤ هەر کارێك ئەنجام بدات، رۆژانە و مانگانە رووبەرووی چەندان دەست کەوت و بڕیاری گرنگ دەبێتەوە، نووسینەوەی هەموو ئەو دەستکەوت و بڕیار و نەخشە و رووداوە گرنگانە لە پەراوێکدا، دەبێتە گەوهەرێکی بە نرخ و مایەی شانازی بۆ داهاتوو، چونکە هەستی کارکردن لەلای مرۆڤ بەهێز دەکات و متمانەی زۆری بۆ پەیدا دەکات. لەلایەکی تر بەردەوام خاڵە بەهێز و لاوازەکانی کەسایەتی خۆت دەزانیت و سودی لێوەردەگریت و هەڵەی خۆت دووبارە ناکەیتەوە، ئەگەر سەرنج بدەین زۆربەی کەسە سەرکەوتووەکان لە بوارێك لە بوارەکانی ژیان، دوای تێپەر بوونی تەمەنێکی زۆر و خانە نشین بوونیان، دەست دەکەن بە بلاّوکردنەوەی یادەوەرییەکانی تەمەنیان، کە بە خوێندنەوەیان مرۆڤ چێژێکی زۆر دەبینێت و لە هەمان کاتدا دەبێتە سەرچاوەیەکی گرنگی زانیاری بۆ ئەو کەسانەی کە تازە هەنگاو بۆ ژیان دەهاوێژن و دەیانەوێت سەرکەوتن بەدەست بهێنن، لەگەڵ ئەوەی ئەم بیرەوەریانە بۆ کەسەکە خۆی گرنگە، لەهەمان کاتدا کەسانی تریش سوودی لێ وەردەگرن، بۆیە ئەگەر مرۆڤ دەستکەوتوو و سەرکەوتنەکانی رۆژ بە رۆژ تۆمار بکات ئەوە دەبێتە پاڵپشتیەکی باش بۆ رۆژانی داهاتوو، گەرم و گوڕی و توانای زیاتر بە کەسەکە دەدات، ئەو مامۆستایانەی دەیانەوێت سەرکەوتن بەدەست بهێنن، پێویست دەکات رەچاوی ئەم خاڵە بکەن و رۆژانە و هەفتانە لە دەفتەری یادگاری کە ناوی بنێین (پەراوی سەرکەوتن) سەرجەم خاڵە بە هێز و رووداوە خۆشەکان تۆمار بکەن.

### ٣- بەرنامە ڕێژی:

هیچ کارێك بەبێ بەرنامە ڕێژی سەرکەوتوو نابێ، هیچ کەسێك نابێت بیر لەسەرکەوتن بکاتەوە ئەگەر هەنگاوی عەمەلی بۆ نەنابێ، نابێت هیچ هەنگاوێکیش بێ نەخشە و پلانێکی پێش وەختە بنرێت، ئەوانەی سەرکەوتن بەدەست دەهێنن لەیەکەم هەنگاویان بە نەخشەو پلانێکی ورد و زانستیانە دەستیان پێکردووە، پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن لە هەموو بوارەکانی تر زیاتر پێویستی بە بەرنامەڕێژی و دانانی نەخشە و پلان هەیە، شتێکی زۆر گرنگە مامۆستا خشتەی ڕۆژانە و مانگانە و ساڵانەی خۆی هەبێت، لەپاڵ ئەمەشدا خشتەیەکی تری هەبێت  بۆ هەڵسەنگاندنی قوتابیەکانی خۆی، ئەم بەنامەڕێژیە بەرچاوڕونی پەیدا دەکات ، دادپەروەری دەچەسپێنێ، کات بەفیڕۆ ناڕوات، سەرکەوتن دێنێتە بەر چاو، ئەوانەی بە هەر بیانویەك پشت لە دانانی نەخشە و پلانی مانگانەو ساڵانە دەکەن، هەرگیز ناتوانن بە ڕێژەیەکی باش سەرکەوتن بەدەست بهێنن، بەڵکو ڕۆژ بە ڕۆژ و لەگەل تێپەڕ بوونی کات ڕووبەرووی گرفت و کێشە دەبنەوە و ناتوانن خۆیانی لێ ڕزگار بکەن.

### ٤- پلەکانی کار.

ژیان فراوان بووە، ئەرکەکانی تاك زۆربووە، مرۆڤ پێویست دەکات لە ڕۆژێکدا چەند کارێك ئەنجام بدات، بەلاّم ئەوەی گرنگە بزانرێت، کامە کار گرنگە و کامە کار گرنگترە، کامەیان سەرەکی یە و کامەیان لاوەکی یە، کامیان کاتی هاتووە و کامیان دەکرێت دواتر ئەنجام بدرێت، چ کارێك پەیوەندی بە مافی خەڵکەوە هەیە، چ کارێك تەنها تایبەتە بە خودی کەسەکەوە.

پەروەردە و فێرکردن، گرینگی دان بە ئامادەکردنی وانەیەکی بەهێز ،

بەرزکردنەوەی ئاستی زانستی و پەروەردەیی قوتابی، لە کارە هەرە گرنگەکانی مامۆستان، ناکرێت بە هەر بەهانەیەك و بە هاتنە پێشەوەی هەرکارێکی تر ئەو ئامانجە سەرەکیانە وەلا بنرێت و فەرامۆش بکرێت، بەو واتایەی لەکاتی فەرمی، قوتابخانە جێ بهێڵدرێت و خەریکی ئەنجامدانی کارێکی تر بیت، یاخود لە کاتی دەوامدا خۆ بەکاری تر خەریك بکرێت، مامۆستامان بینیوە لە قوتابخانە کاری فرۆشتنی ئۆتۆمبیلی کردووە، یاخود خۆی خەریك کردووە بە فرۆشتنی خانوو و زەوی، گەلێك جاریش وانەکەی راگرتووە و خۆی خەریك کردووە بە جێ بە جێ کردنی کاری ماڵەوە ، ئەمانە و چەندان نموونەی تر، بە بەردەوامی هەموو ساڵێك دووبارە دەبنەوە.

## ٥- توانای بەڕێوەبردن.

بەڕێوەبردنی کۆمەڵێك قوتابی لە پۆلدا کارێکی ئاسان نیە، چونکە هەر یەکەیان لە کە سایەتیەکی جیاواز پێك هاتووە، هەیانە ئاستی ژیریان جیاوازە، هەیانە ئاستی وەرگرتنیان جیاوازە، هەیانە ئاستی پەروەردەییان جیاوازە، هەندێکی تر لە جەستە و بیرکردنەوە جیاوازن، بۆ بەڕێوەبردنی ئەو هەمووە جیاوازییە، پێویستە پەروەرشیار خاوەنی هونەرێکی بەڕێوەبردنی بەرز بێت، هەر هەڵەیەك لە بڕیارێك، لەوانەیە کێشەیەکی گەورەی لێبکەوێتەوە، لەلایەکی تریشەوە توانای بەڕێوەبردنی پۆل و پاراستنی یاساکانی، راگرتنی ئارامیەکەی و رووبەروو بوونەوە لەگەل گرفتەکاندا و ئامادەکردنی وەڵامێکی دروستی پێشوەختە بۆیان، خاڵێکی بە هێزە لە خاڵەکانی توانای مامۆستا لە بەڕێوەبردن.

## ٦- پەروەرشیارێکی بە توانا.

پیشەی مامۆستایەتی بۆیە پیشەیەکی هەستیار و پیرۆزە، چونکە لەپاڵ پرۆسەی فێرکردن کە خۆی لە خۆیدا ئەرك و ماندووبوونێکی زۆری دەوێت، پرۆسەی پەروەردەکردنیش هەیە، بەمەش لە پیشەکانی تر جیا دەبێتەوە، لەبەر ئەوەی پیشەکانی تر تەنها راپەڕاندنی کارن بۆ بەرامبەر بەبێ ئەوەی ئەرکی پەروەردەکردنیان هەبێت، بەلاّم مامۆستا لەپاڵ پرۆسەی فێرکردن دەبێت پەروەرشیارێکی بە توانا و بەهێزیش بێت، چونکە داهاتووی هەموو میللەتێك لەبەرەو پێش بردن و دوورخستنەوەی لە نەزانی و تاوان لەسەر ئەستۆی  مامۆستایە، ئەگەر کەسێك باوکی چەند منداڵێك بێت ئەوا مامۆستا باوکی هەموو میللەتە، ئەگەر منداڵێك لاسار بێت ئەوا رووی گلەیی لە باوکی دەکرێت، بەلاّم ئەگەر زۆربەی میللەت لاسار و نەخوێنەوار بوون، ئەو کات تەواوی گلەییەکان دەکەوێتە ئەستۆی مامۆستا، هەر وەك  چۆن میللەتی زیرەك و پێشکەوتوو  بە بەرهەمی دەستی مامۆستا لەقەڵەم دەدرێت، لەبەر رۆشنایی ئەم راستیە مامۆستایان دەبێت هەست بە قورسی ئەرکی سەرشانی خۆیان بکەن، دوو رێگایان لەبەردەم دایە، ئەویش یان میللەتێك بەرەو نەفامی و نەزانی دەبەن، یاخود میللەتێکی هۆشیار و زانست خواز و پێشکەتوو دەهێننە بەرهەم.

# سێ یەم/ لایەنی ژیری

## ١- خاوەن بیرێکی بەهێز.

بوونی هەست و بیرێکی بەهێز بۆ کەسایەتی مامۆستا پێویستیەکی گرنگە، چونکە ئەو ئەرکەی مامۆستا ئەنجامی دەدات ئەم پێویستیە دەخوازێت، لەلایەك بۆ ئەوەی توانای فێرکردنی بەهێزبێت کە ڕێژەیەکی زۆری قوتابی لەبەر دەست دایە، لەلایەکی تر توانای دۆزینەوەی ئارەزووە شاراوەکانی ناو ناخی قوتابیانی هەبێت و گەشەیان پێ بدات ، جگە لەمانە بتوانێت بڕیاری لەجێ بۆ هەرکێشەیەك دەربکات، کاتێك کە پەیدا دەبێت و ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

## ٢-هونەری سەیرکردن.

مرۆڤی لێهاتوو لە یەك سەیرکردن تەنها تەماشای یەك خاڵ ناکات، بەڵکو هەوڵدەدات زۆرترین ڕووبەر ببینێت، ئەم جۆرە سەیرکردنە بۆ مامۆستا زۆر گرنگە، بە شێوەیەك بتوانێت لە سەیرکردنێکی خێرا ژمارەیەکی زۆر لە قوتابیان ببینێت، چونکە ئەگەر وانەبوو ئەوا بە شێکی زۆری پۆلەکە دەبێتە شوێنی ئاژاوە و سەرهەڵدانی دیاردەی نابەجێ و ناشرین، ئەم جۆرە سەیر کردنە هەستێکی گرنگ لەناو ناخی قوتابی دروست دەکات وای لێدەکات کە هەمیشە هۆشیار و بە ئاگا بێت.

## ٣- زیرەکی و ڕۆشنبیری فراوان.

وریایی و ئاگاداربوون لە ڕووداوەکانی ڕۆژانە و شیکردنەوەیان بۆ قوتابیان، هەروەها ئاشنا بوون بە زانست و داهێنانە نوێکان ، هەبوونی زانیاریەکی زۆر دەربارەی مێژووی کۆنی جیهان بەگشتی و مرۆڤایەتی بە تایبەتی، خوێندنەوەی نوێ بۆ ڕوودا و پێشهاتەکان، لەڕێگای هەبوونی پەرتوکخانەیەکی بچووك لەماڵەوە و

سەردانی کردنی پێگەکانی ئەنتەرنێت، ئاستی زیرەکی مامۆستا دەردەخات لەلای قوتابیان، بەمەش تێڕوانینی قوتابیان بۆ ئەو مامۆستایە دەگۆڕێت و زیاتر لێی نزیك دەبنەوە و گوێی خۆیانی بۆ دەکەنەوە، چونکە قوتابی مامۆستا وەك خەزێنەیەکی پڕ زانیاری سەیر دەکات، وادەزانێت کە مامۆستا وەڵامی هەموو پرسیارێکی لەلا هەیە.

ئەگەر چی هۆکارەکانی راکێشانی هەستی وسەرنجی بەرامبەر زۆرن، بەڵام کاریگەر ترینیان ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی وەك کەسێکی زیرەك نیشانی بەرامبەر بدات و وا لە بەرامبەر بکات کە هەمیشە پێویستیان بە ئەو هەیە .

## ٤- کەسێتی داهێنان کار:

دیاردەیەکی زۆر نەخوازراو لەناو زۆربەی مامۆستایان بەدی دەکرێت، ئەویش ئەوەیە مامۆستا لە سەرەتای دەست بەکاربوونی تاوەکو ساڵانێکی زۆر بە یەك رێچکە و بە یەك شێوە وانەکانی خۆی دەڵێتەوە، تا وایلێدێت قوتابیان دەزانن مامۆستا چۆن دێتە ژوورەوە و چی دەڵێت و چۆن جوله دەکات، ئەوەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی کە مامۆستا ساڵانە کارەکەی خۆی هەڵناسەنگێنێ و لایەنە باش و خراپەکانی خۆی دیاری ناکات، بەمانایەکی تر ئەو کەسە لە تەمەنی پیشەکەیدا لەسەر یەك شێواز دەڕوات و هەرگیز بیر لە داهێنان بۆ وانە گوتنەوە و هەڵس و کەوتی خۆی ناکاتەوە، ئەمەش بەرەو لاوازی دەبات و کەلێنێکی گەورە لەکەسایەتی ئەو کەسە دروست دەبێت.

هەندێ کەس وا دەبینن کە داهێنان کاری شتێی خۆرسکە و مرۆڤ لەگەل لەدایك بوونی ئەم توانایەی هەیە، بەڵام ئەمە بۆچونێکی هەڵەیە، چونکە هەموو کەسێك دەتوانێت زیرەك و داهێنان کاربێت، ئەگەر خۆی بیەوێت. کەواتە داهێنان کاری لە چەند کەسێك کۆنەبووتەوە، هەمووومان دەتوانین داهێنان کار بین، دەتوانین شتێك بکەین کەسی تر نەیکردبێت، بابەتی نوێ بهێنینە بوونەوە.

# چوارەم/ لایەنی جەستەیی

**١- وەرزش و گەشتکردن.**

تەرخانکردنی کاتێکی دیاری کراو لە رۆژێکدا بۆ وەرزش کردن و حەسانەوەی جەستەیی زۆر گرنگە، چونکە بیر و هەستی هێمن دەبێتەوە و ئارەزووی لەسەر کارەکەی زیاد دەکات، هێز و توانایەکی زۆرتری بۆ پەیدادەبێت، یاخود رۆژانی پشوو گەشتێك بکات و لە شوێنی کارکردنی خۆی دوور بکەوێتەوە.

**٢- گرنگی دان بە لەش ساغی.**

پیشەی مامۆستایەتی کارێکی قورس و گرانە، هەم ماندووبوونی جەستەیی لەگەڵە، هەم ماندووبوونی بیرومێشك، راپەڕاندنی ئەم ئەرکە گەورە و قورسانەش بە لەشی ماندوو و نەخۆش ئەنجام نادرێت.

**٣- ئاستی دەنگ.**

نزمی ئاستی دەنگی مامۆستا و نەگەیشتنی بە گوێی هەموو قوتابیان، خاڵێکی لاوازە، زۆر جار هۆکاری سەرهەڵدانی کێشە و گرفتە لە ناو پۆل، لەلایەکی تریشەوە بەرزی دەنگ دەبێتە هۆی بێزاری و بێتاقەتی گوێگر، بۆیە پێویستە مامۆستا بەشێوەیەك دەنگی خۆی هەڵبڕێ تا ئەو ئاستەی دوورترین قوتابی گوێبیستی دەبێت بەبێ ئەوەی هاوار بکات، لەگەل بەهێزکردنی هونەری دەربڕینی وشە و رازاندنەوەی بۆ گوێی گوێگر.

# پێنجەم/ لایەنی کۆمەڵایەتی

## ١- باوکێکی میهرەبان.

قوتابی ئەمانەتێکی کۆمەڵگایە دەدرێتە دەست مامۆستا، هەموو دایك و باوکان رۆڵەکانیان ئەمانەتی مامۆستا دەکەن، ئەمەش نەك تەنها بۆ مەبەستی فێر کردن، بەڵکو چاویان لەوەشە بە جوانترین شێوە منداڵەکانیان پەروەردە بکرێت ، لە داهاتوو بۆ خۆیان و بۆ کۆمەڵگاکەیان سود بەخش بن، نەبێتە بار بە سەریانەوە، پێویستە مامۆستا وەك باوکێکی میهرەبان بڕوانێتە قوتابیەکانی، دەستیان بگرێت و رێگای راستیان نیشان بدات، گرنگی بە کێشەکانیان بدات و بۆیان چارەسەر بکات، میهرەبانی خۆی بەسەریان پەخش بکات و دەروونیان ئارام بکاتەوە، بۆ ئەوەی قوتابخانە و خوێندنیان خۆش بووێت و هەنگاو بەرەو سەرکەوتن بنێن.

ئەوانەی وا ئەزانن پیشەی مامۆستایی تەنها گووتنەوەی وانەیە و پێویست ناکات خۆ بە پەروەردەی قوتابی خەریك بکرێ، ئەوانە لە هەڵەیەکی گەورەدا دەژین و هەرگیز لە پەیام و پیشەی مامۆستایی نەگەیشتوون، ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە وا ئەزانم ئەمرۆکە لەناو کۆمەڵگەی ئێمەدا زۆرە ، زۆرێك لە مامۆستایان ئەوە دووپات دەکەنەوە و دەڵێن: (خۆمان کێشەمان زۆر کەمە ئەوجا خۆمان بە کێشەی قوتابی خەریك بکەین، من تەنها دەرسی خۆم دەڵمەوە و حەقم بەسەر پەروەردەوە نیە)، ئەم دەربڕین و تێڕوانینانە، نەخۆشیەکی کوشندەیە و بەر بەستێکی گەورەیە لەبەردەم پرۆسەی پەروەردە، ئەو کەسانەی پیشەی مامۆستاییان قبوڵە، پێویستە قبوڵی ئەوە بکەن کە پەروەرشیارێکی باش و باوکێکی بە سۆز و میهرەبان بن.

## ٢- پەیوەندی کۆمەڵایەتی بەهێز.

مـرۆڤ دروسـتکراوێکی کۆمەڵایەتیـە، لـە هـەموو کاروبـارێکی ژیـان پێویستیان بە یەکتر هەیە، هیچ کەسێك ناتوانێت بە تەنها بژیت و لە کۆمـەڵگا خۆی دوور بخاتەوە، لێکۆڵینـەوەکان دەریـان خسـتووە کـە بـۆ سـەرکەوتنی هـەر کارێك پەیوەندیەکی کۆمەڵایەتی توند و تۆڵ و بەهێز، خاڵێکی زۆر پێویست و کاریگـەرە و گرنگـە، ناکرێـت بـەبێ بـوونی پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتی هـەنگاو بـۆ سەرکەوتن بنرێت، بـۆ سەرخسـتنی پرۆسـەی پـەروەردە و پێگەیانـدنی تـاکێکی کـارا و کاریگـەر، پێویسـت بـەوە دەکـات مامۆسـتا لـەژیانی قوتـابی دانـەبڕێت و خۆی لێ بەدوور نەگرێت ، بەڵکو پەیوەندی کۆمەڵایەتی بـەهێز لەگـەل قوتـابی وماڵەوەی قوتابی دا هـەبێت، چونکە ئەمـە ئـەرکی مامۆسـتا ئاسـانتر دەکـات و رێگا زیاتر خۆش دەکات بۆ ئەوەی قوتابی بە تەواوی گوێ بۆ مامۆستا بکاتەوە و خۆی بە تەواوی بخاتە ژێر دەستی مامۆستاوە.

# بەشی دووەم

## مامۆستا و پۆل

مامۆستا هەرچەندە زیرەك و بەتوانا و خاوەن ئەزموون بێت، هەوڵ و تێکۆشانەکەی شوێنی خۆی ناگرێت و بەرهەمی نابێت، تاوەکو ئەو کەسانەی لەناو پۆلەکەدان ئامادەسازیان تێدا نەبێت بۆ وەرگرتنی زانست و زانیارییەکان، یاخود خودی پۆلەکە بە شێوەیەکی زانستی رێك نەخرابێت، ئەمەش بەوە دەکرێت کە لە هەموو لایەنێکەوە کۆنترۆڵی پۆل بکرێت و سەرجەم پێداویستیە زانستیەکانی بۆ دابین بکرێت، لەم بەشەدا هەوڵدەدەین هاوکاری مامۆستا بکەین و کارئاسانی بۆ بکەین، بە کۆمەڵێك زانیاری گرنگ ئاشنای بکەین، تاوەکو یارمەتی دەری بێت بۆ کۆنترۆڵ کردنی پۆل بە شێوەیەکی زانستی و سەردەمیانە، هەموو ئەو تەم و مژانەی لەلا برەوێنینەوە کە بەرچاوی گرتووە و ناتوانێ هەنگاوی سەرکەوتووانە بنێت، چیتر بە نەزانییەوە نەچێتە ناو پۆل و وانەزانێت وانە گوتنەوە تەنها خۆ ئامادەکردنێکی سادەیە و هیچ پەیوەندییەکی بە قوتابی و پۆلەوە نیە.

# هەنگاوی یەکەم

## پێداویستیەکانی پێش چونەژوورەوە

**١- بەهێزی لە خۆ ڕێکخستن:**

گەلێك جار مامۆستا لەپۆلدا پێویستی بە (پارچە کاغەزێك، یاخود قەڵەمێك، یا تەباشیر.......) دەبێت، بۆ ئەمە لە قوتابیەکانی یاخود لەپۆلەکەی نزیکی داوا دەکات ، لەم کاتەدا لەوانەیە هەرا و دەنگە دەنگ سەرهەڵبدات، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە مامۆستا پێش هاتنە ناو پۆل خۆی ڕێك نەخستووە و پێویستیەکانی خۆی نەهێناوە. ئەوەی داوا دەکرێ ئەوەیە کەمامۆستا پێش ئەوەی هەنگاو بنێ بۆ ناو پۆل دەبێت تەواوی پێداویستیەکانی خۆی ئامادەبکات و خۆی بە جوانی ڕێك بخات ، ڕێگا نەدات کەلێنێکی وا دروست بێت، کە ببێتە هۆکارێك بەدەست قوتابیانەوە بۆ ئەوەی ئارامی پۆل تێك بدەن، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تر زۆر دووبارە کردنەوەی ئەم کارە کەسایەتی مامۆستا لای قوتابی لاواز دەکات و قوتابییەکان مامۆستاکە بە مامۆستایەکی بێ بەرنامە و بێ خەم (اهمال) دادەنێن، مامۆستاکەش ناتوانێت لێپێچینەوە لەگەڵ قوتابیان بکات لەسەر نە هێنانی پێداویستیەکانی خۆیان.

**٢- زانینی زمانی جەستە:**

لە کاتی گوتنەوەی وانەدا، ئەگەر پۆلەکە (٤٠) کەسی تیا بێت، ئەوا تەنها (٨٠) گوێچکە گوێگر نیە، بەڵکو (٨٠) چاویش سەیر دەکەن، لەبەر ئەمە پێویست دەکات مامۆستا زۆر وریا بێت، دەبێت بزانێت کە چۆن( دەست و چاو

و لاشــە و رووخســار و وەســتان و شــوێن گــۆڕین و ............)خــۆی بــە کــار دەهێنێـت، مامۆسـتا لەسـەریەتی خـۆی کـۆنترۆل بکـات و لـە سوچـێکی پۆلەکـە خۆی نەشارێتەوە. بۆ ئەمەش پێویستە رەچاوی ئەم خاڵانە بکرێت:

ا-بەردەوام چاوت لەسەر قوتابیەکانت بێت.

ب- وەستانت لەپۆل رێك بێت و دوور بێت لە خۆ لارکردنەوە.

ج-قوتابیـەکانت زوو زوو بێـدار بکـەوە، تـاوەکو هەسـت بکـەن تـۆ ئاگـاداری ئەوانیت.

د- لە شوێنێك بوەستە کە تەواوی پۆلەکە لەژێر کۆنترۆڵی خۆتدابێت.

هـ- بەنەرمی و بە باوەر بەخۆبوونەوە رێنماییەکانت دەربکە.

ی- پەلە لەوانە گوتنەوە مەکە.

## ٣- فێرکردن بە هێما :

کەسی سەرکەوتوو لە پۆلدا دەتوانێـت قوتابیـەکانی فێـری چـەندەها هێمـا و ئیشارەت بکات بۆ ئەو مەبەسـتەی کـە خـۆی دەیـەوێت، یـاخود بـۆ ئـەو قسـە و گوفتـارە پەروەردەییانـەی کـە دەیـەوێت بیانگەیـەنێت، بـەم هـەنگاوە دەتـوانی کـاتێکی زۆر بـۆ خـۆت بگێریتـەوە، لەهـەمان کاتـدا ووزە و توانایـەکی کـەمتر دەچـووێنی، هەوڵـدان و بیرکردنـەوە بـۆ بـە ئـەنجام گەیانـدنی ئـەم هـەنگاوە کـارێکی زۆر سـانایە، تـەنها بەبیرکردنەوەیـەکی کـەم لـەدەرەوەی پـۆل دەتـوانین چـەندەها رێگـا بدۆزینـەوە کـە پەیوەنـدی هـەبێ بـە جولانـدنی جەسـتە و هێماکردن بـە یـەکێك لـە ئەندامـەکانی لـەش، هـەروەکو چۆن بەرێوەبەرایـەتی هاتوچـۆ بـەبێ هـەبوونی هـیچ پۆلیسـێکی هاتووچـۆ لـە شـەقامەکان رێنمـایی دەداتە شوفێران لە رێگای هێماکانی سەر شەقام، بەهەمان شـێوەش رێنیشـاندەر

و پەروەرشیاران دەتوانن لە رێگای بەکار هێنانی هێماوە، بەرامبەرەکەیان فێری چەندان شتی بەسود بکەن، مامۆستای وا هەیە تەنها بە دانانی تەباشیرەکەی دەستی و کەمێك وەستا لە وانە گوتنەوە، تەواوی پۆلەکە دەخاتەوە ژێر کۆنترۆڵی خۆی، یاخود بە دەست بەرزکردنەوەیەك، یا سەیرکردنێکی جیاواز. هونەر و هێماکان زۆرن بەلاَم گرنگ ئەوەیە کە مامۆستا سود لەم هێمایانە وەربگرێت و کاریان پێ بکات، بەکارهێنانی هێماکان بە تەنها ئامانج نیە، بەڵکو ئەوەی گرنگە هێمای پێویست بۆ کاتی پێویست بەکار بهێنرێت.

## ٤- بەچاوی کەسێکی تر قوتابییەکەت هەڵمەسەنگێنە:

زۆر جار وا رێك دەکەوێت هەندێك لە قوتابیان گرفتیان لەگەڵ مامۆستایەك دەبێت و خۆشیان ناوێت، گوێگری بۆ ناکەن و ناچنە ژێر باری رێنماییەکانی، بگرە زۆرجاریش لە وانەکە ناچنە ژوورەوە، لەگەڵ گەیشتنی ئەم هەواڵە بە بەرێوەبەر و دەستەی مامۆستایانی قوتابخانە، ئیتر هەموو مامۆستایان خۆیان دەکەنە خاوەنی گرفتەکە و لە کاتی چوونە ژوورەوەیان بۆ ئەو پۆلە، بە چاوێکی تاوانبارانە سەیری قوتابییەکان دەکەن، بە تایبەتی بۆ ئەو قوتابییانەی کە خاوەن کێشەکەن، بگرە جاری وا هەیە سەرکۆنەشیان دەکەن، کە ئەمەش لە شوێنی خۆی نیە، چونکە هەڵسەنگاندنی مامۆستا لەلایەن قوتابیانەوە جیاوازە، ئەگەر قوتابیەك لە بەرامبەر مامۆستایەك هەڵە بکات لەوانەیە زۆر بەئاسانی بە قسەی مامۆستایەکی تر داوای لێبوردن بکات، هەڵە کردن دیاردەیەکی ئاساییە، بەلاَم گرنگ ئەوەیە لە ئاستی خۆی گەورە نەکرێت و درێژەی پێنەدرێت، دەبێت خۆمان دادوەربین و لە روانگەی

خۆمانەوە قوتابی هەڵبسەنگێنین، نەوەك بە قسەی کەسانی تر سزا بەسەر بەرامبەرەکەمان بسەپێنین، خۆ خزاندنە ناو کێشەی مامۆستایەك کە لەگەڵ قوتابییەکانی هەیەتی کارێکی تەندروست و زانستیانە و پەروەردەییانە نیە، چونکە بەم خۆ بەخاوەن کردنە گرفتەکان خراپتر دەبن و داوەکە زیاتر ئاڵۆز دەبێت، زانایان باس لەوە دەکەن:( ئەگەر مامۆستایەك گرفتێکی هەبوو ئەوا بۆ ئەوانی تر بێدەنگ بوون باشترین رێگایە، ئەگەر نەیاتوانی رێگا چارەیەك بۆ کێشەکە بدۆزنەوە)

## ٥- رق لەدڵ هەڵمەگرە:

پەیدا بوونی کێشە و سەرهەڵدانی گرفت لەناو پۆلدا کارێکی ئاساییە، بەتایبەتی کاتێك قوتابیەك یان پۆلێك هەڵسوکەوتێکی ناشرین و نابەجێ بەرامبەر مامۆستا ئەنجام دەدەن، سەرهەڵدانی کێشە پێویستی بە چارەسەر هەیە، پێویستیشە بۆ رۆژی دواتر تەواوی رووداوەکە لە بیر بکرێت، بۆ نموونە ئەگەر تۆ کێشەیەکت لەگەڵ یەکێك لە پۆلەکان هاتە پێش، لە هەمان کاتدا تۆش پۆلەکەت هێور کردەوە و ئامۆژگاریت دا بە قوتابیەکان، پۆلەکە ئاسایی بوویەوە، یاخود لە رێگای بەرێوەبەرەوە گرفتەکەتان چارەسەرکرد، پێویست ناکات بۆ رۆژانی تر تۆ وا سەیری ئەو قوتابیانە بکەیت کە هێشتا تاوانبارن و کێشەکە کۆتایی نەهاتوو، بەڵکو دەبێت بە شێوەیەکی وا بڕوانیتە قوتابیان کەرۆژێکی نوێ هەڵاتووە و هیچ کاریگەریەکی دوێنێت لەسەر نەماوە، جاری واهەیە لەبەرامبەر کارێکی ناشرینی قوتابیەك تا کۆتایی ساڵ مامۆستا هەوڵی تۆڵە سەندنەوە دەدات، بە چاوێکی ئاسایی سەیری قوتابیەکە ناکات، بەڵکو گەلێ جاریش بە ئەنقەست لە وانەکەش دەری ناچووێنێ، یاخود بەگرانکردنی

پرسیارەکان و زۆرکردنی ئەرکی ماڵەوە تۆڵە لە قوتابیان دەکاتەوە، هەمیشە لە فرسەتێك دەگەرێت سزای قوتابیەکە بدات، هەموو ئەمانە لە ئاستی کەسایەتی ماموٚستا کەم دەکاتەوە، جگە لەوەی ئەم رق هەڵگرتنە،دوورە لە ئامانجەکانی پەروەردە و فێرکردن، ئەم ساڵ لەگەڵ یەکەم رۆژی قوتابخانە چوومە پۆلێکی دوانزەمی ئامادەیی، یەکێك لە قوتابییە ئامادە بووەکان زۆر بێتاقەتی پێوە دیاربوو، منیش هۆکارەکەیم پرسی، وەڵامی دامەوە گوتی(( ماموٚستا چ بڵێم !! ئەو دەرسەی رۆیشت ماموٚستایەکمان لەلابوو، لە پۆلی دەیەم هەندێ ناخۆشی لە نێوانمان رویدابوو، ئەویش کە منی ناسیەوە، یەکەم قسەی ئەوە بوو پێی گووتم تۆ ئەمساڵ دەرناچی، ئەم قسەیە لە ناخەوە برینداری کردووم و تووشی شۆك هاتووم)) ئەم جۆرە رق هەڵگرتنە بۆ ماوەی دوو ساڵ هەرگیز لەگەل کەسایەتی ماموٚستا یەك ناگرێتەوە چونکە بڕیار وایە ماموٚستا تا سەر ئێسقان لێبووردە و لێ خۆشبوو بێت.

## ٦-سەرپێچیەکان بناسە:

گرنگە ماموٚستا پێش ئەوەی بچێتە پۆل هەموو ئەو سەرپێچیانە بزانێت کە قوتابی لە پۆلدا دەیکات، وەك( درەنگ هاتن بۆ ژوورەوە، نەهێنانی پێداویستی قوتابخانە، ئامادەنەکردنی ئەرکی ماڵەوە، زۆرقسەکردن، جولەی زۆر، جێگاگۆڕین، شت خوارد، دڕاندنی کاغەز....هتد.) لەوەش گرنگتر ئەوەیە پێش ئەوەی ئەم دیاردانە رووبدەن تەواوی رێگاچارەکان لەبیری خۆی ئامادەبکات، بەمە ئامادەیی دەروونی بۆ پەیدا دەبێت و دەتوانێت دادپەروەر بێت لەبریاردانیش و بە یەکسانی سەیری هەموو قوتابیەکانی بکات، ئەوانەی پێش چوونە ناو پۆل بیر لە هیچ شتێك ناکەنەوە و پێش بینیان نیە بۆ روودانی

هیچ کارێك و هەڵس و کەوتێك، ئەوانە لەهەموو کەسێك زیاتر دووچاری گرفت دەبنەوە، جگە لەوەش زۆربەی جار هەندێك رووداو و دیاردەی بچوك لەناو پۆلدا سەرهەڵدەدات، بەلاّم بەهۆی نەهێنانە پێش چاو و پێشبینی نەکردنەوە رووداوەکە گەورە دەبێت و لەژێر کۆنترۆڵ دەردەچێت.

### ٧- پەرە بە هونەری دەربڕین بدە:

دەربڕینی وشە چەکێکی دوو سەرە، جاری وا هەیە سود بەخشە و هەندێ جاریش دەبێتە هۆی گرفت بۆ خاوەنەکەی، بۆیە پێویست دەکات مامۆستا لە دەربڕینی وشەکان هونەرمەند بێت، پێش دەربڕین بیر لەهەموو ئەو وشانە بکاتەوە کە نیازی هەیە دەریان ببڕێت، دەبێت بزانێت کە چ کاریگەریەکیان دەبێت لەسەر بەرامبەر، گەلێك جار روویداوە مامۆستا ئامۆژگاری چاکی قوتابیانی کردووە، بەلاّم وشە و دەربڕینەکان بوونەتە کێشە و کەش و هەوایەکی نائارامیان دروست کردووە، بەبێ ئەوەی مامۆستاکە هیچ نیازێکی خراپی هەبێت، کورد دەڵێ ( قسە بیگێڕە، بیبێژە، بیوێژە).

### ٨- کارنامە.

یەکێك لەم هۆکارانەی کە رەغبەتی قوتابی بەهێز دەکات و پاڵی پێوەدەنێ بۆ سەرکەوتن، دروستکردنی فایلی کارنامەی قوتابییە، ئەم کارنامەیە لەلایەن مامۆستاوە ئامادە دەکرێت، هەر قوتابیەك چەند پەڕێکی بۆ تەرخان دەکرێت و ناوی تەواوی لەسەر دەنوسرێت، تەواوی ئەو چالاکی و کارە چاکانەی کە قوتابی ئەنجامی دەدات و بە دەستکەوتی دادەنێ لە ناو پۆل و لە قوتابخانە، لەم چەند پەڕە تۆمار بکرێت، باشترە قوتابی ئاگاداری ئەم کارە بێت

و بیبینـێ، ئەنجامـدانی ئـەم کـارە هەرچـەندە هێـز و توانـاو کـاتی زۆر دەوێـت، بەڵام بەرهەمێکی چاك و دڵخۆشکەرانەی دەبێت.

## ٩- ئامادەکردنی وانە.

ئامـادەکردنی وانــە بـەر لـە چـوونە ژوورەوە، کۆمـەڵێك کاردانــەوەی گرنگـی دەبێت، کە راستەوخۆ هۆکارێك دەبن بۆ سەرکەوتن لە گوتنـەوەی ئـەو وانەیـە، متمانە لەلای قوتابی زیاد دەبێت و زیاتر گوێگر دەبێت و هەست و شـەوقی بـۆ وانەکـە روو لـە زیـادبوون دەکـات، جگـە لەمـە مامۆسـتاکە لایـەنی دەروونـی بەهێزتر دەبێت و بروا بەخۆبوون پەیدا دەکات، دوور دەکەوێتـەوە لـە هەڵـە و ئاڵۆزی، دووبارەکردنەوەی زۆر رووندادات و ئاگاداری کات دەبێت.

## ١٠- هەڵسەنگاندنی وانەی رابردوو.

نابێـت مامۆسـتا وانەیـەك بـە رێ بکـات و بچـێت بـۆ وانەیـەکی تـر بـەبێ ئەوەی وانەی رابردوو هەڵنەسەنگێنێ، بەبێ ئـەوەی بزانـێ ئاسـتی وەرگـرتن و تێگەیشـتنی وانەکـە چـەند بـووە، لەبـەر ئـەوە دوای تـەواو بـوونی وانەیـەك پێویستە مامۆستا وەڵامی ئەم پرسیارانە وەربگرێت:

- أ- ئایا وانەکە ئامانجی خۆی پێکاوە؟.
- ب- ئایا قوتابییەکان بەشداری گەرمییان هەبوو؟.
- ت- هیچ شتێك لەوانەکە جێنەماوە کە شایەنی پێداچوونەوە بێت؟.
- پ- بابەتەکە لەگەل ئاستی قوتابیان چۆن بوو؟.
- ج- ئایا من وەك مامۆستای وانە رازیم و دڵخۆشم بە گوتنەوەی وانەکە؟

# هەنگاوی دووەم

## قوتابییەکەت بناسە...

### ١- زانینی ناوەکانیان:

ناسینی ناوی قوتابیان لەلایەن مامۆستاوە کاریگەرییەکی ئیجابیانەی هەیە، ناو هێنانی قوتابی لەلایەن مامۆستا لەکاتی پرسیار کردن هەستێکی گەورە لە ناخی قوتابی دروست دەکات، هەرچەندە ناسین و لەبەر کردنی ناوی سەرجەم قوتابیان کارێکی ئاسان نیە، بەڵام پێویستیەکی گرنگە و ناکرێت پشت گوێ بخرێت.

### چەند رێگایە بۆ ئاسان لەبەرکردنی ناوی قوتابیان:

ا- دابەشکردنی شوێنی قوتابیان بەپێی ئەلف و بێ ی کوردی.

ب- نووسینی ناوی قوتابی لەسەر تەختەکەی بەردەمی بە بەردەوامی.

ج- چواندنی ناوی قوتابی بەشتێك کە لەبیری تۆ نزیکە.

د- بەردەوام لەبیرت بێت و بە ئەرکێکی پێویستی بزانە.

### ٢- حەز و ئارەزووی قوتابییەکەت بناسە.

تێکەڵ بوون لەگەڵ ناخی قوتابی و ناسینی حەز و ئارەزووەکانی، کارئاسانی زۆر بۆ مامۆستا دەکات، چونکە دەتوانی بەپێی حەزی قوتابیەکە نموونەی بۆ بهێنیەوە و لە بابەتەکە نزیکی بکاتەوە ، بەمەش هەست و تێڕوانینی قوتابی بۆلای خۆت کێشدەکەیت و متمانەی لەلا زیاد دەکەیت، بۆ

ناسینی ئـەم حاڵەتـەش پێویستە لەسـەرەتای ساڵەوە هەوڵ بـدرێت و بکرێتـە بەرنامە و کاری لەسـەر بکرێت، ئەگـەر مامۆسـتا رۆژێـك دیـاری بکات بـۆ ئـەم مەبەسـتە و واز لـە گوتنـەوەی وانەکـە بهێنێـت، دەتوانێـت زۆرێـك لەنهێنیـە شاراوەکانی ناو ناخی قوتابی ئاشکرا بکات.

## ٣- ناسینی هەستی قوتابی:

زۆربەی جار وا دەردەکەوێ کە قوتابیان واهەست دەکەن کە ئەو کارەی ئەوان هیچ سودێکی نیە، خوێنـد هەوڵـدانێکی بـێ سـودە و دەرنجـامێکی باشـی نیـە، لـە دەرەنجـامی ئەمەشـەوە لاوازی دەروونـی دایـان دەگرێـت و باوەڕیـان بەخۆیان نامێنی، پێویستە مامۆستای پەروەرشیار بەردەوام کار لەسەر هەسـتی قوتابی بکات و رێگایان بۆ رۆشن بکاتەوە، پێیان رابگەیەنێت کە داهاتووی هـەر گـەل و میللـەتێك بەنـدە بەخوێنـدن وخوێندەوارییـەوە ، ئـەویش لەدەسـتی قوتـابی دایـە، فێریـان بکات،(ئامـابوونی قوتـابی لـەپۆل،هێنانی پـەرتووك و پێداویسـتی خوێنـدن، ریزگرتنـی ئـارامی پۆل،خـاوێنی، هاوکـاری یـەکتری، ئامادەکردنی وانەکانی رۆژانە، بەشـداری کـردن لەگـەل مامۆسـتا بـۆ گوتنـەوەی وانـەکان) لـەکارە هـەرە گرنگـەکانی قوتابییـە، هەرچـەندە سـەرەتا لەوانەیـە قوتـابی بـەم داواکارییانـەی تـۆ پێبکـەنێ و هاوکاریـت نـەکات یـان بـە گـران وەریبگرێن، بەلاًم بەردەوامی تۆ و سوربوونت لەسـەر گەیانـدنی ئـەم راسـتیانە دەچێتە ناو ناخی قوتابی و لەناوەوە هەستێکی گەورەی بـۆ دروسـت دەکـات کـە ریز لە وتەکانی تۆ و ماندوبوونی خۆی بگرێت.

## ٤- ناسینی جۆرەکانی فێربوونی گوێگر:

هەموو مرۆڤەکان بۆ فێربوون و وەرگرتن وەکو یەك نین، هەر کۆمەڵێك کەس لە ڕێگای یەکێك لە هەستەکانەوە فێر دەبێت، جیاوازی هەستەکان مرۆڤەکانیش پۆلین دەکات و وایان لێدەکات ڕێگای فێربوونیان جیاواز بێت:

**ا- فێربوون لە ڕێگای چاو:**

ئەو کەسانەی لە ڕێگای چاوەوە فێر دەبن، زۆر قسە دەکەن، دەڕواننە داهاتووی خۆیان، توانای بڕیاردانی خێرایە، هەڵەی بەرامبەر زۆر دەگرێت و زوو دەرکی پێ دەکات، شتەکان جوان دەبینێ، لەبەرکردنی باش نیە، دەیەوێت هەموو شتێك بزانێت، لە ڕێگای نیشاندانی وێنە و سەیرکردنەوە فێردەبێت.

**ب- فێربوون لە ڕێگای گوێ:**

ئەو کەسانە بەهۆی بیستنەوە فێر دەبن، زۆر قسە لەگەل خەڵك دەکەن، پرسیاریان زۆرە، حەز لە مناقەشە و گفتوگۆ دەکەن، توانای لەبەرکردنیان بەهێزە، هەست بەهەموو دەنگێك دەکات و دەتوانێت لێکیان جیا بکاتەوە، حەزدەکات شتەکان نەبینێ بۆ ئەوەی جوان ببیسێ، بە گوێگرتن و لەبەرکردن فێر دەبێت.

**ج- فێربوون لە ڕێگای هەستەوە.**

ئەم جۆرە کەسانە زیاتر هەستی ناخەوەیان بە هێزە، هێمن و بێدەنگن، ئیشارەت بۆ کردنێك یان تەنها دەست بڵندکردنێك بۆی، تێ دەگات و کاری تێدەکات، دەستی زۆر بەکاردێنێ لە قسە کردن، دەچێتە ناو وردەکاری شتەکانەوە، بیری هەردەم لە ڕابردووی خۆیەتی، زۆر جولە دەکات، بڕیار لەسەر شت دەدات بە پێی هەست و زەوقی خۆی.

## ٥-جیاوازی ئاستی تەمەن.

کەسی بچووك لە فێربوون و هەستکردنو وەرگرتن جیاوازە لەگەڵ کەسێکی گەورە، نابێت بەیەك چاو سەیری قوتابیەکی بنەڕەتی و قوتابیەکی ئامادەیی بکرێت، کاتێك ماموٚستایەك لە قوٚناغی بنەڕەتی دەچێت بوٚ قوٚناغی ئامادەیی یاخود بە پێچەوانەوە، پێویستە تەواوی هەست و شارەزایی و هەڵسوکەوتی خوٚی بگوٚڕێت، لەم نەخشەی خوارەوە هەندێك لەو جیاوازییانە دەخەینە روو کە لە نێوان قوتابیەکی ئامادەیی و قوتابیەکی بنەڕەتی هەیە.



| قوتابی تەمەن بچووك (بنەڕەتی) | قوتابی تەمەن گەورە (ئامادەیی) |
| --- | --- |
| ١- هەمیشە وەرگرە و بەشداریکەر نیە.<br>٢- توانای فێربوونی لاوازە پێویستی بە دووبارەکردنەوەی وانەکە هەیە.<br>٣- هەڵسەنگاندنی نیە بۆ وانەکە.<br>٤- لە ڕێگای قسە بۆ کردنەوە فێر دەبێت.<br>٥- جۆری دانیشتنی ئاسایی نیە، زۆر دەجولێت و لە دانیشتن بێزار دەبێت.<br>٦- هاتنی بۆ قوتابخانە ئیجبارییە. | ١- لەگەڵ ئەوەش وەرگرە، بەشداری لە شیکردنەوەی وانەکەش دەکات.<br>٢- توانای فێربوونی بەرز و بەهێزە.<br>٣- زۆرجار رەخنە لە مامۆستا دەگرێت و وانەکە هەڵدەسەنگێنێ.<br>٤- لە ڕێگای بەشداری پێکردن و پرسیار لێکردنەوە فێر دەبێت.<br>٥- دانیشتنەکانی ئاسایی و یاساییە.<br>٦- هاتنی بۆ قوتابخانە ئارەزوو مەندانەیە. |

# هەنگاوی سێ یەم

## هەڵسوکەوت لەگەڵ قوتابی

**١- رووخۆشی و قسەخۆشی لەناو پۆلدا :**

سروشتی وانە گووتنەوە وایە، ئەوەی کەوا لەپۆلە و گوێگرە زوو بێتاقەتی دایدەگرێت و بیری دەڕوات، بۆیە پێویستە مامۆستای پەروەرشیار ناوە ناوە قسەی خۆش و پەند و نوکتەی کورت و لەبار تێکەڵ بەوانەکەی بکات، بۆ هێنانەوەی بیری قوتابی بۆ وانەکە. بەلأم مامۆستا دەبێت بۆ جێ بەجێ کردنی ئەم خاڵە وریا بێت و رەچاوی ئەم خاڵأنە بکات:

أ/ دەبێت مامۆستا پێش شۆخی کردنەکەی لەوە دڵنیا بێت، کە دەتوانێت بەئاسانی دەست بەسەر کەش و هەوای پۆلەکەدا بگرێتەوە و بیگێڕێتەوە دۆخی جارانی.

ب/ پێویستە ئەو نوکتە و قسەخۆشانە پەیوەندیان هەبێت بە وانەکە و بابەتی ئامادەکراو، دوور بێت لە توانج لێ دان لە قوتابی یان شارەکەی یان عەشیرەتەکەی یاخود ئاینەکەی یاخود هەرشتێکی تر کە لە لای قوتابیان ریزی بۆ دادەنرێت، چونکە ئەم نوکتانە لەبیری قوتابی تۆمار دەبێت و هەرگیز لەیادی ناکات، لەگەل ئەوەش کە ناتوانێ وەلأمی مامۆستاکەی بداتەوە، دەبێتە گرێیەك لە ناو دەروونی قوتابی و بەربەستێك لە نێوان مامۆستاکە و قوتابیەکە دروست دەکات، دەرەنجام ئەم قوتابیە وای لێدێت بە باش و بە خراپ گوێ بۆ قسەکانی مامۆستا راناگرێت و سودی لێ نەبینێ.

ج/ زۆر کورت بێت و کاتی وانەکە نەکوژێت.

**٢- هاوڕێیەتی نەوەك دوژمنكاری:**

گەلێك لە مامۆستایان بەتوند و تیژی هەڵسوکەوت لەگەڵ قوتابیەكانیان دەكەن، هەرگیز دەرگای خۆشەویستی خۆیان ناكەنەوە ، هەندێكی تر لە مامۆستایان خۆشەویستیەكی زۆر و لەڕادەبەدەر دەدەن بە قوتابی، ئەم دوولایەنە هەردووكیان خراپن و زێدەڕۆییان تێدایە، مامۆستا دەبێت هەمیشە ئاگاداربێت و سنورێك لەنێوان خۆیی و قوتابیەكەی بهێلێتەوە، چونكە مامۆستا سەركردەی پۆلە، سەركردەش هەمیشە پێویستی بە توند و تۆڵی هەیە، دەبێت وریای ئەوەش بین كە توند و تۆڵیەكە نەگاتە ئاستی رووبەروو بوونەوە،كورد گوتەنی(نەئەوەندە شیرین بیت بخورێیت، نەئەوەندە تاڵیش بیت فڕێ بدرێیت).

**٣-كێشكردنی هەستی قوتابی:**

كەسایەتی مامۆستا پێش چوونە ژوورەوە یان لە كاتی چوونە ژوورەوە كاریگەرییەكی راستەوخۆی هەیە لەسەر هەستی قوتابی، ئەگەر مامۆستا بە باوەربەخۆبوونێكی زۆر و بەسەر بەرزی بە دڵێكی گەش و روویەكی خۆش چووە پۆلەكەی، راستەوخۆ هەستێكی بەهێز لای قوتابیان دروست دەبێت و یارمەتیان دەدات بۆ زرنگی و وریای و گوێگرتن لە وانەكە، بە پێچەوانەوە، بێ زەوقی مامۆستا و نیشاندانی بێتاقەتی لە یەكەم ساتی چوونە ژوورەوە هەستی وەرگرتن دەكوژێت و بەرامبەر هەست بە بێزاری دەكات و خەواڵوو دەبێت.

**٤- دووركەوتنەوە لە هاوار كردن.**

لە كاتی روودانی هەر كارو كردەوەیەكی ناشرین و نابەجێ لەپۆلدا،

نابێت پەنا ببردرێت بۆ بەر هاوار کردن و قیژاندن، هەروەکو هەنـدێ مامۆسـتا نـەك تـەنها پۆلەکـەی خۆیـان بـەڵکو چـەند پـۆلێکی نزیکـی خۆشـی سـەخڵەت دەکات، هاوارکردن هێز و توانـای مامۆسـتا لـەناو دەبـات و وێنـەی مامۆسـتا لای قوتابیان ناشرین دەکات، بێ توانایی و بێ دەسـەلأتی نیشان دەدات، ئەمـە جگـە لـەوەی کـە هـاوار کردنەکـە دیاردەکـە چـارە ناکـات، بـەڵکو گـەڵێ جـار کێشـەی زیـاتری لـێ دەکەوێتــەوە، لەبــەر ئەمــە پێویســتە لــەجیاتی هـاوارکردن ئــەم هەنگاوانە رەچاو بکرێت:

ا- مامۆستا لە کارەکەی بوەستێت و بە چاوێکی زویرانە سەیری قوتابیـەکان بکات.

ب- پێویستە مامۆستا بەدەنگێکی نەرم و کز هەنـدێ قسە بکات، بـۆ ئـەوەی سـەرنجی قـەتابی بـۆ لای خـۆی کـێش بکـات و قوتابیـان حەزبکـەن و بـزانن مامۆستا چ دەڵێت.

ج- بوەستە و سەیری ئەو کەسـە بکە کـە دەتـەوێ قسـەی لەگـەڵ بکـەیت، تـا ئەو بێدەنگ دەبێت و دەرفەتی تەعلیق هاوێشتنی نامێنێ.

د- بە بەرزکردنـەوەی دەسـتەکانت داوا لـەقوتابیان بکە کـە بێـدەنگ بـن بـێ ئەوەی قسە بکەیت.

هـ- پـاش ئـەم هەنگاوانـە فرسـەتت دەبێـت بـۆ ئـەوەی پـەیامی خـۆت بدەیتـە قوتابیان.

## ٥-هێمنی تـاجی سەرکەوتنە.

نائـارامی پـۆل هەرچـەندە زۆر بێـت و لـە سـنور دەرچـوونی قوتابیـان چـــەندە زیـــاد بێـــت، پێویســـت ناکـــات پـــەنا ببردرێتـــە بـــەر تـــوڕەیی و

خۆسـووركردنەوە، بـەڵكو چـەندی دەكرێـت پێویسـتە مامۆسـتا خۆگربێـت و هێمنی دەروونی خۆی بپارێزێت، بەمە گەورەیی خۆی لای قوتابیان دەردەخاتْ، بەڵێ مرۆڤی هێمن دەزانێن چۆن بیردەكاتەوە و چۆنیش چارەسەر بۆ كێشەكان دەدۆزێتـــەوە، توڕەبـــوونیش ئـــاگری دەروون هەڵـــدەكات و چـــرای بـــیر دەكوژێنێتەوە.

## ٦- بەربەرستەكانی پۆل بۆ قازانجی خۆت بەكاربهێنە.

ئەو كەسانەی زۆرجار دەبنە بەربەست لەكاتی وانە گوتنەوە بۆ مامۆسـتا، ئەوقوتابیانەن كە لەدواوە دادەنیشن، یان ئەوانەن كە زۆر قسەدەكەن و ئـەركی رۆژانە ئامادە ناكەن، مامۆسـتا دەتوانێـت تـەواوی ئـەو قوتابیانـە دەسـت نیشـان بكات و بیاناسێت، بۆ ئەوەی هەر یەكەیان بەكارێكەوە سەرقاڵ بكـات و لەپۆلـدا شتێكیان داوا لـێ بكـات بـۆ ئـەوەی ئـەنجامی بـدەن، بـۆ نموونـە ( نـاو نووسـینی قوتابیە نەهاتووەكان، یان هێنانە پێشەوەیان، یاخود بیكاتە نوێنـەری خـۆی بـۆ ئەوەی پرسیار لە قوتابیان بكات، جاریواش هەیە دەتوانێ ئەركێكی بداتێ و لـە كۆتایی بە نمرە پاداشتی بداتەوە...............هتد).

## ٧- ورەی قوتابییەكانت بەرزبكەوە.

لـە رۆژانـی یەكـەمی هاتنـە قوتابخانـە مامۆسـتا دەتوانێـت بـەردەوام مەدحی قوتابیان بكات لەسـەر هـەموو ئـەو كـارە باشـانەی كـە ئـەنجامی دەدەن، وەك(زوو ئامـادەبوون لـەپۆل، نـەجولان و قسـەنەكردن، ئامـادەكردنی ئـەركی ماڵەوە، بەشداری كردن لەوانەكە، پاراستنی خـاوێنی پـۆل، برایـەتی و هاوكـاری نێوان قوتابیان.....هتد.).بەردەوام بوون و سوربوون لەسەر ئەم كارە، هەسـتی قوتابی بەهێز دەكات و هانی دەدات بۆ سەركەوتن.

# هەنگاوی چوارەم

## خاڵەکانی سەرکەوتن لە پۆل

مرۆڤی پەروەرشیار دەتوانێت لەسەرەتای دەستکردن بەخوێند تاوەکو کۆتایی ساڵ، پارێزگاری لە سەرجەم هەموو ئەو دیاردە باش و چاکانە بکات کە خۆی لێی رازییە و باوەڕی پێیەتی لە رووی فێرکردن و پەروەردەییەوە، ئەمەش بەوە دەبێت کە پەیڕەوی بنەما زانستیەکانی پەروەردە بکات و هەمیشە لە هەوڵی پەیداکردنی زانیاری نوێ بێت.

**١- سەرەتای وانەگووتنەوە( دۆڕان یان بردنەوە ).**

وانەکانی یەکەمی سەرەتای ساڵ هەنگاوێکی گرنگە بۆ دەستپێکردنێکی دروست و چوون بەرەو سەرکەوتن، لەبەر ئەمە پێویستە زۆر وریا بین، ئەگەر لەیەکەم هەنگاو سەرنەکەوتین، ئەوا تا کۆتایی ساڵ دۆزەخێك بۆ خۆمان دروست دەکەین کە بەئاسانی ناتوانین بەرگەی بگرین، بۆیە زۆر لە مامۆستایان لەم یەکەم  هەنگاوە بێزاری دایان دەگرێت و هەوڵی خۆ گوازتنەوە دەدەن بۆ قوتابخانەیەکی تر، پێویستە سەرەتای وانەکان بە قسەی جوان و رووی خۆش و هاندان و نیشاندانی خۆشەویستی و خەمخۆری دەست پێبکەین، دوور بکەوینەوە لە رووگرژی و سەرکۆنەکردن و شکاندنەوە و گران نیشاندانی خوێندن و نزم سەیر کردنی ئەرکی قوتابی، کە هەموو ئەمانە راگەیاندنی سەرەتای شەڕە لەگەل قوتابی.

## ٢-دیاری کردنی ئەرك.

رۆژێك لە قوتابخانە زەنگی تەواو بوونی وانەیەك لێیدا، زۆری پێنەچوو یەك پۆلی تەواو لەدواوەی مامۆستایەك رایان دەکرد، قوتابیەکان داوایان دەکرد ئەو ئەرکەی کە مامۆستا دیاری کردووە زۆرە و کەم بکرێتەوە، مامۆستاکەش لەبەر ئەوەی لە پرۆگرامی ساڵ دواکەوتبوو پێداگری دەکرد لەسەر بریارەکەی، دوای هەرایەکی زۆر بەرێوەبەری قوتابخانە داوای لە قوتابیەکان کرد کە شوێنەکە جێبهێلن و بچنەوە پۆلەکەیان.

دیاریکردنی ئەرکی ماڵەوە و لێپرسینەوە و دانای نمرە ، هەروەها پشکنینی وەرەقەی تاقیکردنەوەی قوتابی دوو خاڵن کە زۆرجار دەبنە هۆکاری دروست بوونی ئاژاوە لە پۆلدا. هەندێ جاریش بە ئەنقەست قوتابی دەیکاتە هەلێك بۆ ئەوەی بارودۆخەکە تێك بدات، لەبەرئەمە پێویست دەکات رەچاوی ئەم خالانە بکرێت:

١-گرنگی دان بەئەرکی ماڵەوە و پشتگوێ نەخستنی.

٢- ئەرکەکە لە ئاستی قوتابیان بێت ، نە زۆربێت نەکەم.

٣- جەخت کردنەوە لەسەر ئەوەی قوتابی خۆی ئەنجامی بدات.

٤- راستکردنەوەی هەڵەکان بۆ ئەوەی دووبارە نەبنەوە.

٥- دەبێت مامۆستا لەوە دڵنیا بێت کە تەواوی قوتابیان گوێبیستی ئەو بوونە و ئەرکەکەیان لای خۆیان تۆمار کردووە.

٦- هاندان و دەستخۆشی لە تەواوی ئەو قوتابیانەی کە ئەرکەکەیان بەجێ گەیاندووە.

٧- رەزیلی نەکردن لەدانانی نمرە بۆ ئەوانەی کە بەشێوەیەکی رێك ودروست

یان ئەوانەی بەشێوەی لاوەکی ئەرکەکانی ماڵەوەیان بە جێگەیاندووە.

٨- دانـانی کـاتی شـیاو بـۆ پشـکنینی وەرەقـەی تاقیکردنـەوە، تـاوەکو هەڵـەی تێدانەکرێت و دادپەروەری بچەسپێ.

٩- رەخسـاندنی کەشـێکی ئـارام و گـوێگرتن بـۆ قوتابیـان لـەکاتی دانــەوەی نمرەکان، چونکە هەموو کەسێك قابیلی هەڵەکردنە.

١٠- ئەگەر ئەرکەکە تایبەت بوو بەپۆل پێویستە رەچاوی کات بکرێت و نەگاتـە کۆتایی وانەکە.

١١- روون کرنەوەی تەواو دەربارەی ئەرکـەکان، بەشـێوەیەك هـیچ گرێیـەك لای قوتابی نەهێڵێتەوە.

١٢- دانای پرسیارەکان بە شێوەیەك بێت کە تەواوی قوتابیان بتـوانن بەلایـەنی کەم نیوەی نمرەی دیاری کراو بهێنن، خۆدوورگرتن لە پرسـیاری نـاڕوون و گران و دوور لە وانەکە.

١٣- سزای پێویست بدرێت بە هەموو ئەو قوتابیانەی کە کەمتەرخەمی دەکـەن لە ئەنجام نەدانی یاخود دواخستنی ئەرکەکە.

١٤- باش نیە هیچ ئـەرکێکی تـر بـدرێت بـە قوتـابی تـاوەکو ئەرکەکـەی پێشوو تەواو نەبێ.

### ٣- تێکەڵ نەکردن.

هـەموو بابـەتێك سـەربەخۆیی تایبـەتی خـۆی هەیـە، بـەهیچ شـێوەیەك ناکرێت لەسنوری یەك وانە دوو بابـەت شـیبکرێتەوە و تێکـەڵ بکـرێن، هەنـدێ جار بەهۆی مانـەوەی کـات لەوانەیـەك یـان بـەهۆی ترسـان لـە تـەواو نـەکردنی

مەنهەج، یان هەرهۆکارێکی تر، مامۆستا پەنا دەباتە بەر تێکەڵکردنی دوو بابەتی سەربەخۆ، ئەمەش ساردی و بێتاقەتی لای قوتابی دروست دەکات و بیری تێکەڵ دەبێت و توانای گوێگرتن و بەشداریکردنی نامێنێ، لەمەش ترسناکتر ئەوەیە مامۆستا بەزۆر و چاوسورکردنەوە هەردوو بابەتەکە تێکەڵ بکات و بەسەر قوتابیانی بسەپێنێ.

**٤- پردی پەرینەوە.**

هەموو وانەیەك کە مامۆستا دەیڵێتەوە، لەچەند بەشێك پێکهاتووە، پێویستە زۆر وریا بین لە پەرینەوە لە بەشێك بۆ بەشێکی تر، بۆ ئەوەی نائارامی و پشێوی دروست نەبێت، دەبێت مامۆستا دڵنیا بێت لە تێگەیشتنی تەواوی قوتابیان لەبەشی یەکەم ئەمجا بپەڕێتەوە بۆ بەشی دووەم، ئەمەش بەوە دەکرێت، داوا لەچەند قوتابییەك بکرێت بەکورتی بەشەکە دووبارە بکەنەوە، نووسینی چەند خاڵێکی گرنگ تایبەت بە بەشەکە لەسەر تەختە رەش، باشترە لە نێوان بەشەکان وەستانێکی کورت هەبێت لە بێدەنگی وەك پاداشتێك بۆ قوتابیان، پاشان بەشێوەیەکی سەرنجراکێش بەشەکەی تر دەست پێبکرێتەوە.

**٥- سود وەرگرتن لە ئەزموونی کەسانی تر.**

هەنگ بۆ ئەوەی شیلەیەکی پاك و سود بەخش بەرهەم بهێنێ لەسەر هەموو گوڵێك دەنیشێتەوە و شتێکی لێ هەڵدەگرێت، پشتبەستنی مامۆستا تەنها بە ئەزموونی خۆی بۆ کۆنترۆڵ کردنی پۆل بەس نیە، بەڵکو مامۆستای سەرکەوتوو بەبەردەوامی پرسیار لەمامۆستایان دەکات و ئەزموونەکانیان وەردەگرێت، وەك خۆی یان لەگەل هەندێ دەستکاری سودی لێ وەردەگرێت.

### ٦- بنیادنەری:

پێویستە هەموو هەڵوێست و قسەیەکی مامۆستا ئامانجێکی بنیادنەرانەی لەپشتەوە بێت، بەتایبەتی کاتێك مامۆستا دەخوازێ قوتابیەك هۆشیار بکاتەوە، یاخود رەفتارێکی ناشرینی قوتابیەك چاك بکاتەوە، دەبێت ئامۆژگاریەکانی بەو شێوەیە بێت کە قوتابیەکە پێی خۆشە، نەك دەربرینەکان بە شێوەیەك بێت باسی خوە ناشرینەکە بکات و لەسەری بڕوات و درێژەی پێبدات، بۆ نموونە ئەگەر قوتابیەکە زۆر قسە دەکات پێی بڵێ (ئەوە چەند جارە من داوات لێدەکەم بێدەنگ بیت، بەڵام تۆ بەکارەکەت سەخڵەتم دەکەی) یان بڵێ (ئەوەی من دەبینم هەموو قوتابیان بێدەنگیان پاراستووە، تەنها هەندێك نەبن بەردەوامن و من چاوەروانیان دەکەم بزانم تا کوێ دەڕۆن). بەهەمان شێوە دەکرێت وشەی جوان و بنیادنەرانە بەکاربهێنین لەشوێنی جوێندان و خۆتوڕەکردن و شکاندنەوە.

### ٧- بەکارهێنانی تەختەرەش.

گەلێك جار کەسایەتی مامۆستا لەو شتانە دەخوێندرێتەوە کە لەبەر دەستی دایە، رێك و پێکیان مانای رێك و پێکی مامۆستایە و بە پێچەوانەوە. تەختەرەش کە مامۆستا زۆر بەکاری دەهێنێت، پێویستە ئەم خالانە رەچاو بکات:

أ- بەردەوام پاك و خاوێن بێت.

ب- دابەشکردنی تەختەرەش بۆ دوو بەش یان زیاتر.

ت- هەموو وانەکە نەنوسرێتەوە، بەڵکو بەکورتی گرنگترین خالەکانی

وانەکە بنووسرێت.

پ- بەکار نەهێنانی خوارەوەی تەختەرەش بۆ نووسین یان وێنە.

ج- بەکارهێنانی تەباشیری رەنگاورەنگ .

ح- وەستان لە لایەکی تەختەرەشکە و زۆر پشت لە قوتابیان نەکرێت لەکاتی نووسین.



# هەنگاوی پێنجەم

## رووبەڕوو بوونەوەی کێشەکان و چارەسەرکردنیان

ئـەوەی وا دەکـات مامۆسـتا لـە قوتابخانـە بێـزار بێـت و پیشـەکەی خـۆی خـۆش نـەوێت، دروسـت بـوونی کێشـەی زۆرە، سروشـتی پیشـەی مامۆسـتایەتی وایە هەرکە هاتە ناو سنوری قوتابخانە کێشە گەلێکی زۆری بۆ دروست دەبێت، چ لەگەل ئیدارە بێت یـان لـە ژوورەوە لەگـەڵ قوتـابی، بـەلاَم ئـەوەی دووەمیـان کاریگەرییەکەی زۆرترە لەسـەر هەست و نـاخی مامۆسـتا، بـە تایبـەتی ئەگـەر ئـەو مامۆسـتایە تەمـەنێکی کـەمی هـەبێت لـە نـاو پیشـەکەی، یـاخود ئاسـتی رۆشنبیری بۆ چارەسـەرکردنی ئـەو کێشانەی بـەرەو رووی دەبنـەوە نـزم بێـت. هـەر بۆیـە پێویسـتە بـەردەوام خوێنـەوار بێـت و زانیـاری زۆری لابێـت لەسـەر ناسـینی بەرامبـەر و جـۆری کێشـەکان و رێگاکـانی چارەسـەرکردنیان. هـەروەها چاوکراوە بێت بۆ ئـەو کێشانەی کـە بـۆ مامۆسـتا هاوڕێکـانی دروسـت دەبێـت، هـەوڵ بـدات بزانێـت کێشـەکە بـۆ سـەری هەڵـداوە و چـۆن چـارەکراوە، لـە لێکۆلینەوەیەکدا کە لەسەر مامۆستایانی هـەرێم ئـەنجاممان دا دەرکـەوتووە کـە زۆربـــەی مامۆســـتایان بـــەبێ زانیـــاری زانســـتی و لێکدانـــەوەی لایەنـــە جۆربەجۆرەکان کێشەکانی خۆیان چارەسەر دەکەن، هەروەها بە بێ پلان و بە شـێوەیەکی عەشـوایی و بـێ پرسـکردن بـە کەسـانی بـە ئـەزموون رووبـەڕووی کێشـەکان دەبنــەوە، کـە ئەمانــەش زۆربـەی جـار لــەجیاتی چارەسـەر کـردن، گرفتی گەورەتر بەدوای خۆیدا دەهێنێت.

لە خوارەوە باس لە هونەری چارەسەری کێشەکان دەکەین. چارەسەری کێشە پێویستی بە چەند هەنگاوێك هەیە بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی زانستی و راست و دروست پێشی لێ بگیرێت کۆنترۆڵ بکرێت، هەر بۆیە زانایان بە هونەرێکی سەربەخۆی دادەنێن، وەکو هونەرەکانی مامەڵەکردن لەگەڵ خەڵك، هونەری سود وەرگرتن لە کات، هونەری خوێندنەوە.........هتد.



# هەنگاوەکانی چارەسەری کێشە

**١- پێناسەی کێشەکە:**

سەرەتا دەبێت کێشەکەمان ناسیبێت و بەرِێکی دیاریمان کردبێت و پێناسەیەکی کورتمان بۆ دانابێت.

**٢- هۆکارەکانی سەرهەڵدانی :**

ئەم کێشەیە بۆچی سەری هەڵداوە و هۆکارەکانی چیە؟، چ کەسێك بەرپرسە لە سەرهەڵدانی، تاوەکو بە هەڵە کەسێك و شتێکی تر نەکەینە هۆکار.

**٣- رێگا چارەکان:**

نابێت بۆ چارەسەر تەنها بیر لە یەك رێگا بکەینەوە، هەموو کێشەیەك کۆمەڵێك رێگای هەیە بۆ چارەسەرکردنی ، هەروەها لەناو ئەو کۆمەڵە رێگایە دەبێت باشترین رێگا هەڵبژێرین.

**٤-دانانی بەرنامەی کار:**

هەرکاتێك کێشەکەمان ناسی و هۆکارەکەمان دەستنیشانکرد و رێگاچارەکانمان خستە ڕوو، دەبێت بەرنامەیەکی وردی بۆ دابرێژین، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی پلەبەندی و هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵی برۆین و بنەبری بکەین.

# چەند هەنگاوێکی پێویست لەکاتی رووبەروو بوونەوەی کێشەدا :

١- گەڕانەوە و دان نان بەو هەڵەیەی کە کێشەکەی لێ پەیدابووە.

٢-پەلەنەکردن و خۆ ئارامکرنەوەیەکی تەواو لە کاتی رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ کێشەکەدا.

٣- گومانی باشت بۆ کەسەکان هەبێت و قوتابیەکی زۆر لە کێشەکە تێوە نەگلێنرێت.

٤- شاردنەوە و ئاشکرانەکردن و گەورە نەکردنی کێشەکە زۆر پێویستە، تا رێگا چارەی بۆ دەدۆزرێتەوە.

٥- هەڵسو کەوتی جوان و ئەنجامدانی کاری چاك لەگەڵ گومان لێکراو.

٦- پەنا نەبردن بۆ شتی نایاسایی و ئاڵۆز نەکردنی.

٧- گوێنەدان بە قسەی خەڵك و گەڕانێکی ورد بۆ چارەی کێشەکە.

٨- هەموو کات بۆ رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ کێشەدا خۆت ئامادە بکە، بە چارەسەر بوونی کێشەکە دڵنیامەبە کە سەر هەڵناداتەوە.

# هەندێك كێشە كە لە پۆلدا رووبەرووی مامۆستا دەبێتەوە، لەگەڵ چارەسەرەكەی.

## ١- داواكاری قوتابی لە پۆل.

وا روودەدات هەندێك جار لەپۆلدا قوتابیەك گرفتێكی دەبێت و داوای یارمەتی لە مامۆستا دەكات، لەم كاتە كە مامۆستا لە ناو پۆلدایە و وانەكە شی دەكاتەوە، پێویست ناكات بچێتە لای قوتابیەكەو گوێی بۆ بگرێت، چونكە ئەمە كێشەی زیاتر دروست دەكات، چونكە بەم كارە مامۆستاكە پشت لە قوتابیەكانی تر دەكات و هاتوهاوار دروست دەبێت، چاكترین رێگا لەم بارەدا قوتابیەكە بانگ بكە بۆلای خۆت و گوێی بۆ بگرە و بەچاویش سەیری سەرجەم قوتابیەكانی تر بكە، تا هەست بكەن تۆ ئاگاداری ئەوانی.

## ٢- هەڵسوكەوتە ناشرینە شاراوەكان.

كاتێك مامۆستا هەندێك قوتابی دەبینێت لە پۆل رەوشت بەرزو گوێگرن، بەلاّم هیچ چالاكیەكان نیە و هەلّپەیان نیە بۆ فێربوو، لەم بارەدا كاتێكی زۆریان بۆ تەرخات دەكات، لەخەمیاندا دەبێت بۆ ئەوەی بیانگۆڕێت، ئەمە دەبێتە فرسەتێك بۆ سەرهەڵدانی ئەو رەوشتە ناشرینانەی كە هەندێ قوتابی لە كەلێنێك دەگەڕێن ئەنجامی بدەن، بۆیە نابێت مامۆستا ئەم كەلێنە بۆ قوتابی بكاتەوە، لەجیاتی ئەم خۆ خەریككردنە بە بەشێك لە قوتابیەكانی، پێویستە بەرنامەی تایبەتی هەبێت بۆیان، ناوەناوە بەبیریان بهێنەوە، كە ئێوە پێویستە فێربن، وەكو قوتابیەكانی تر بەشداری وانەكە بكەن.

## ٣- گاڵتەچیانی پۆل.

هەندێك قوتابی خویان بەوە گرتووە کە گاڵتەجاری بەهاوڕێکانی پۆلەکەیان بکەن، سەرەتا ئاگادارکردنەوە بۆ ئەمانە شتێکی چاك و لەبارە، بەلاَم بە هیچ شێوەیەك نابێت فرامۆش بکرێن، پێویستە هەنگاوی تری پەروەردەیی بۆیان بگیرێتە بەر، بەلاَم ئەگەر بەردەوام بوون پێویستە بەرێوەبەری قوتابخانەی لێ ئاگاداربکرێتەوە.

## ٤- کات کوشتن.

یەکێکی تر لەو کێشانەی کە قوتابی دروستی دەکات لە پۆلدا، وروژاندنی بابەتێکە کە هیچ پەیوەندی بە وانەکەوە نەبێت، پرسیاری لەسەر دروست دەکات و داوا لە مامۆستا دەکات وەلاَمی بداتەوە، زۆربەی ئەم کارانەش بۆ کوشتنی کاتی وانەکەیە، بە تایبەتیش ئەگەر قوتابیەکە لەهەستی مامۆستاکە گەیشتبێت و بزانێت بە چ بابەتێك دلَخۆش دەبێت، ئەم دیاردەیە بەر بلاَو و زۆرە، مامۆستا دەبێت زوو هەست بەو دیاردەیە بکات و داوا لە قوتابیەکە بکات کە ئەمە بۆ کۆتایی وانەکە هەلَگرێ، دەست بە شیکردنەوەی وانەکەی خۆی بکاتەوە، ئەگەر هەر بەردەوام بوو، دەبێت بە نەرمی پێی بگوترێت ئەم پرسیارەی تۆ هیچ پەیوەندی بە وانەکەی ئێمەوە نیە چاکتروایە قسەی لەسەر نەکەین.

## ٥- کەمکردنەوەی ئەرك.

گـەلێك جـار رێـك دەكـەوێت ئـەو ئەركـەی مامۆسـتا دیـاری دەكـات ، قوتابیان بەزۆری دەزانن و ناڕەزایی دەردەبڕن، پێداگری مامۆسـتا لـەم حاڵەتـە شـتێكی بـاش نیـە، چـونكە لەوانەیـە هـەرای بـەدواوە بێـت، پێویسـتە گـوێ بـۆ قوتابییەكان بگیرێـت و هەنـدێ گۆڕانكـاری ئـەنجام بـدات، ئەگـەر كـەمیش بێـت، لەهـەمان كاتیشـدا نابێـت مامۆسـتا ئەوەنـدە نـەرم بێـت بـە بچـوكترین داوای قوتابیەك  بەشێكی زۆری ئەركەكەی كەم بكاتەوە.

## ٦- گوازتنەوەی قوتـابی.

مامۆستایان بۆ چارەسەری هەندێ كێشە قوتابی لە شوێنێك دەگوازنـەوە بۆ شوێنێكی تر، گرفتەكە لەوێوە سـەر هەڵدەدات كاتێـك قوتابیەكـە لەبـەردەم هاوڕێكانی رەتی بڕیارەكەی مامۆستا دەكاتەوە و ئامادە نابێت شوێنەكەی خـۆی جێبهێڵێـت. بـۆ ئـەوەی ئـەم كێشـەیە سـەر هەڵنـەدات، دەبێـت ئـەم هەنگاوانـە بنێین.

أ- ئاگاداركردنەوەی قوتابیەكە كە دەیگوازیتەوە.

ب- ئەو شوێنەی نیشان بدە كە بۆی دەیگوازیتەوە.

ت- بیخـە نێـوان دوو بڕیـار (دەچـیتە ئـەوێ یـان بێـدەنگ دەبیـت و وازدێنیت).

## ٧- هێنانی كەلوپەلی نایاسایی.

بە پێی یاسا هێنانی ئـامێری مۆبایـل و ئەنگوسـتیلە و ملوانكـەو لەبـەر نـەكردنی یەكپۆشـی لـە زۆربـەی قوتابخانـەكان قەدەغەیـە. ئـەركی مامۆسـتا

ئەوەیە لە سەرەتای وانەکە بە نەرمی قوتابیەکان ئاگادار بکاتەوە و ناوەکان لای خۆی تۆمار بکات، هەروەها یارمەتی دەستەی ڕێککاری قوتابخانە بدات ئەگەر هەوڵی بنەبڕکردنی ئەمانەیاندا، بەلاٚم ئەگەر بەرێوەبەر و لیژنەی ڕێککاری بێدەنگ بوون لە ئاست سەرپێچیەکانی قوتابی، پێویست ناکات ماموٚستا خۆی سەنگەر لە قوتابیان بگرێت و لەگەڵیان توند بێت، بەڵکو پێویستە وەکو پێشنیار بەرێوەربەری لێ ئاگادار بکاتەوە .

## ٨- توانج لیٚدان.

هەندێ جار قوتابی توانج لە ماموٚستاکەی دەگرێت بۆ ئەوەی بێزاری بکات و وانەکەی پێ رابگرێت، ئەم دیاردەیەش جۆراوجۆرە، ماموٚستا پێویستە بیر بکاتەوە و سەیر بکات ، ئایا توانجەکە دووبارە و سێ بارە دەبێتەوە، لەم حاڵەتە بێ دەنگی و پشت گوێ خستن باش نیە، دەبێت چارە بکرێت، بەلاٚم ئەگەر تەنها یەك جار روویدا، باشتر وایە بەدوایدا نەچیت و قسەی زۆری لەسەر نەکرێت.

## ٩- دەست بلّندکردن.

پرسیارکردنی ماموٚستا و دەست بڵندکردنی قوتابیان بۆ وەلاٚم دانەوە، گەلێك جار کەش و هەوای پۆل لەسنوری خۆی دەترازێنێ و بەرەو هاوار و غەلبە غەلب دەچێت، چونکە قوتابیان بەبێ مۆڵەت وەرگرتن هەموو پێکەوە دەست بڵند دەکەن، بۆیە دەبێت ماموٚستا قوتابیەکانی فێربکات، کە بە هیچ شێوەیەك لەکاتی پرسیارکردن بەبێ مۆڵەت وەرگرتن لە شوێنی خۆیان هەڵنەستن و هاوار نەکەن، دەبێت قوتابی لەم بارەیەوە فێربکرێت و لایەنە

باش و خراپەکانی ئەم دیاردەیە بزانێت، هەروەها نابێت مامۆستا ئەو کەسانە هەلبسێنێ کە مۆڵەت وەرناگرن و لە سنور دەردەچن، بەڵکو پێویستە بەردەوام ئاگاداربکرێنەوە، لەهەمان کاتدا هانی ئەو کەسان بدرێت کە بەبێ دەنگی دەست بەرز دەکەنەوە و مۆڵەت وەردەگرن. بەخشینی کات بۆ قوتابیان بۆ بیرکردنەوە لە کاتی پرسیارکردن لێی شتێکی پێویستە. بۆ رزگار بوون لەوەی هەر تەنها چەند کەسێك دووبارە نەبنەوە لە پۆل، دەکرێت ئاراستەی پرسیارەکان هەرجارەی بۆ ریزێکی پۆلەکە بێت.

**١٠- پرسیاری دەرەکی.**

کاتێك مامۆستا قول دەبێتەوە لە گوتنەوەی وانەکە و دەچێتە ناو وردەکاریەکان، لەبەرامبەریشدا قوتابیان بێدەنگن، لەم ساتەدا قوتابیەك دەست هەڵدەبڕێت و پرسیارێکی دەرەکی دوور لە وانەکە دەکات، خۆگرتن لەم هەلۆێستە لەلایەك زۆر پێویستە، لەلایەکی تر دان بەخۆداگرتنێکی زۆری دەوێت، تاوەکو هەم مامۆستاکە نەکەوێتە هەڵەوە، هەمیش کەسایەتی قوتابیەکە نەشێوێندرێت، چونکە لەوانەیە بە ئەنقەستی نەبێت، لەلایەکی تر نابێت مامۆستا هەڵبچێت و وازلە گوتنەوەی وانەکە بهێنێت، بەڵکو پێویستە.

أ-بەخێرایی وەڵامی قوتابیەکە بدرێتەوە و زوو بۆ خودی وانەکە بگەرێینەوە.

ب- داوا لە قوتابیەکە بکرێت پرسیارەکە لە بیر نەکات و هەڵی بگرێت بۆ کۆتایی وانەکە.

ت- فێربکرێت، کە ئەم جۆرە پرسیارانە پێویستە لە دەرەوەی پۆل بکرێت.

## ١١-نەزانینی وەڵام لای قوتابی.

پرسیاکردن لە قوتابی لە پۆلدا و نەزانینی وەڵامەکەی، هەندێك جار مامۆستا تورە دەکات و ئاراستەی وانەکە تێك دەچێت و کێشەی تر دروست دەکات، گەڵێ جار لەسەر ئەم هەڵوێستە رووداو گەلێکی زۆر روویانداوە، لەوانەشە هۆکارەکەی مامۆستاکە خۆی بێت، چونکە نەیتوانیوە بە جوانی پرسیارەکە ئاراستەی قوتابییەکەی بکات، دەبێت لەکاتی پرسیار کردن رەچاوی ئەم خاڵانە بکەین.

أ- پرسیارەکە روون بێت و لە ئاستی قوتابییەکەدا بێت.

ب- پرسیارەکە لە چوارچێوەی وانەکە دەرنەچێت و شتێکی نوێ نەبێت لای قوتابی.

ت- کورت و پوخت بێت.

پ- ورد و دیاریکراو بێت.

ج- پرسیارەکە بۆ بیرکردنەوە بێت نەك بۆ هەڵبژاردن.

ح- ئامانج لێی فێرکردنی قوتابی بێت نەك بەهانەگرتن پێی.

## ١٢- ئاستی زمان.

گەڵێ جار مامۆستا گفتوگۆ لەگەل قوتابی دەکات، بەڵام قوتابییەکە تێناگات و هیچ وەڵامێك ناداتەوە، ئەم دیاردەیە زۆرجار دەبێتە سەرهەڵدانی کێشە لە نێوان مامۆستا و قوتابی، بەبێ ئەوەی هۆکارەکەی بزانرێت. کە لەوانەیە زۆربەی جار هۆکارەکەی بگەرێتەوە بۆ ئەو ئاستەی کە مامۆستا لە قسەکردندا دەریدەبرێت. قوتابی سەرەتایی زمانێکی سادە و ساکاری پێویستە کە دوور بێت لە وشەی قورس و دەربڕینی گران، بە پێچەوانەوە قوتابیانی ئامادەیی پێویستە زمانێکی ئەدەبی پوخت و خێرا لەگەڵیان بەکار بهێنرێت.

### ١٣- پشتکردن لە قوتابی.

ئەو مامۆستایانەی زۆر پشت لە قوتابی دەکەن کێشەیان لەناو پۆلدا زیاترە، چونکە زیاتر دادەبڕێن لەسەیرکردنی قوتابیان و جولە و رەفتارەکانیان نابینرێت، ئەوانیش فرسەت وەردەگرن و حەز و ئارەزووە کپ کراوە و شاراوەکانیان بەبێ ئاگای مامۆستا دەردەخەن، ئەم پشت کردنەش لەو گەڕان و هاتووچۆیەی مامۆستا پەیدا دەبێت کە لە پۆل ئەنجامی دەدات.

### ١٤- پشکنینی نمرە.

کاتێك مامۆستا کاغەزی تاقیکردنەوە دەداتەوە قوتابی، ئەوانیش ناڕەزایی دەردەبڕن و مامۆستا توڕە دەکەن و کێشە پەیدا دەکەن، بۆ ئەوەی ئەم کێشانە روونەدەن، ئەم خالآنە رەچاو بکە.

١- پشکنینی وەرەقەی قوتابی بە قەڵەمێك بکرێت، کە جیاواز بێت لەگەڵ ئەو قەڵەمەی قوتابی بەکای هێناوە.

٢- سەیرنەکردنی ناوی قوتابی، چونکە بەم سەیرکردنە وێنەی قوتابی دێتەوە بەر چاو، ئەمەش کار دەکاتە سەر نمرەکانی پشکنین و دادوەرانە نابێت، بەڵکو نمرەکە کەمتر یان زیاتر دەبێت.

٣- هەموو پرسیارەکانی یەك قوتابی بەیەك جار نەپشکێندرێت، بەڵکو پێویستە پرسیارێك بۆ هەموو قوتابیەکان تەواو بکرێت، پاشان بچینە سەر پرسیارێکی تر.

٤- ئەو پرسیارانەی کە قوتابی هەڵەی تێدا کردووە دەستنیشانی بکە، پاشان ئاراستەی قوتابیەکانی بکەوە، بۆ ئەوەی وەلامی راست وەربگرن و لە هەڵەکەیان دڵنیابن.

# هەنگاوی شەشەم

# ســـزا و پـــاداشـت

پـێش هـەموو شـتێك دەبێـت ئـەوە جـوان فـەهم بکـەین بـە جـوانی تێـی بگـەین، کـە مەبەسـتمان لـە سـزادانی قوتـابی، ڕێنمـایی کـردن و چـاککردن و فێرکردنیەتی، نەوەك تۆڵە و ڕژاندنی ڕق و کینە بەسـەریدا. لـە ڕوانگـەی ئـەم تێگەیشـتنەوە باوەڕمـان بـە سـزادان هەیـە، چـونکە ئاشـکرایە کـە فێرکـردن و ڕێنمایی کردن لە تەمەنی منداڵیدا ئاسانترە، لەوەی کە کەسەکە گەورە دەبێـت، چونکە منداڵ ئامادە باشیەکی لە ڕادەبەدەری هەیە بـۆ فێربـوون و گۆڕانکاری، زانایانی بواری پەروەردە تاوەکو ئەم ساڵانەش دژی هـەموو سـزادانێکی منـداڵ بوون، بەڵام دوای ئەوەی لێکۆڵینەوەکان دەریان خست، کە ئەم جۆرە بۆچـونانە نەوەیەکی وایان لە ئەوروپا بەگشتی و بە تایبـەتی لـە ولایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێگەیاندووە، کە ئامادەی چەشـتنی هـیچ جـۆرە سـزادانێك نـین، جـا بەهەر هۆیەکەوە بێت، ئەم لێکۆڵینەوەیانە، بیری زانایانی بەرەو ئەوە بـرد، کـە دەبێـت بگەڕێنـەوە بـۆ ئـەو ڕاسـتیەی کـە منـداڵ دەبێـت فێـری چەشـتنی سـزا بکرێت لە بەرامبەر هەڵەکانی، هەر زانایان خۆیان ئەم جـۆرە سـزادانانەیان بـۆ منداڵی لادەر داناوە، بە مەرجێك سزا دانەکە جەستەیی نەبێت و ئیهانـەکردنی تێدا نەبێت و کەسایەتی منداڵ لەکەدار نەکات.

**١- سزادانی قوتابی بە هێشتنەوەی لە قوتابخانە دوای تەواوبوونی دەوامی ئەو رۆژە بۆ ماوەیەکی کەم:**

لەگەل ئەوەی هەندێ سودی هەیە، بەلاّم چاکتر وایە مامۆستا بیر لە رێگای تر بکاتەوە، چونکە ئەو شێوە سزادانە کۆمەلێك خالّی لاواز بە دوای خۆیدا دەهێنێ وەك:

ا- قوتابی زیاتر رقی هەلّدەستێ و دەروونی نائارام دەبێت بەرامبەر بەو مامۆستا.

ب- مامۆستا خۆشی بەشدار دەبێت لە سزاکە و ماندووبوونێکی زیاتر دەبینێ.

ج- کاتێکی زۆر بە بێ سود لە هەردوولا دەڕوات.

**٢- سزای گرووپ نەك هەموو:**

کاتێك ئارامی پۆل تێکدەچێ و هاوارو ڤیژەلێدان دروست دەبێت، زۆربەی مامۆستایان لە ناکا و بەبێ بیرکردنەوە سزای هەموو پۆلەکە دەدەن، ئەم جۆرە سزادانە هەلّەیە، چونکە زۆرێك لە قوتابیان بەشداریان نەکردووە لە خراپە کارییەکە، باشتر وایە بە گرووپ سزا بدرێن، واتە ئەو شوێنەی هەراکەی لێوە دروست بووە، ریزی دواوە، یان ناوەند یان هەر شوێنێکی تر ئەمانە سزاکە وەربگرن.

**٣- پێداهەلّگووتن:**

مەرج نیە شکاندنەوەو قسە پێگووتن و دەرکردن بۆ قوتابی لاسار چارەسەر بێت، بەلّکو زۆرجار مەدح کردن و پێداهەلّدان و هاندانی ئەو

کەسانەی نائارامن لە پۆل، رێگاچارەیەکی باش دەبێت بۆ چاککردنیان، کورد دەڵێ (دوژمنی خۆت بە شەکراو بخنکێنە) هەرچەندە هیچ کەس قوتابی بە دوژمنی خۆی نازانێت، بەلاَم هەمیشە قسەی خۆش زووتر شوێنی خۆی دەگرێت، لە شکاندنەوە و جوێندان و قسە پێ گوتن.

**٤- کێشانەوەی دیاری.**

مامۆستایان یان قوتابخانە، لەسەرەتای خوێندنەوە کۆمەڵێك وەعد و پەیمان و بەخشین بۆ قوتابیان وەك دیاری دەخەنە روو، تاوەکو قوتابی هانبدەن بۆ خوێندن، دەکرێت لە کاتی سەرپێچی قوتابیەك یان کۆمەلێك قوتابی مامۆستا ئەو کەسانە لەو دیارییانە بێ بەش بکات.

**٥- گەورە نەکردنی سزاکان.**

هەموو سەرپێچیەیەك سزایەکی خۆی هەیە، ئەوانەی بچووکن دەبێت سزاکەشیان سووك بێت، بە پێچەوانەوە سەرپێچی گەورە دەبێت سزاکەشی توند بێت، بەلاَم دەبێت وریا بین شتی بچووك گەورە نەکەین، زۆر لەگەل قوتابی پێدانەچین، نەوەك هەڵەی گەورەتر بکات وکۆنترۆڵی خۆی لەدەست بدات.

**٦- تانەدان لە خوی ناشرین.**

قوتابی وەك مرۆڤ مافی پاراستنی کەسایەتی خۆی هەیە، نابێت لە کاتی هەڵەیەك هێرش بکرێتە سەر قوتابی و کەسایەتی بریندار بکرێت، بەڵکو دەبێت پێی بگووترێت، ئێمە رقمان لەتۆ نیە وەك قوتابی، بەڵکو رقمان لەو خوە ناشرینەیە کە تۆ هەتە، بەمە قوتابیەکە هەڵەی خۆی دەزانێت و کەسایەتیشی پارێزراو دەبێت.

## ٧- ماڵەوەی قوتابی.

زۆربەی سەرپێچیەکان دەتوانین لە رێگای ماڵەوەی قوتابیەوە چارەسەر بکەیت، بە ئاگادارکردنەوەی باوکی یاخود دایکی لە کاتی هەر لادان و نارێکیەك، ئەمە کاریگەرییەکی زۆری دەبێت لەسەر قوتابی و هەوڵی خۆ چاکردن دەدات، بە پێچەوانەشەوە لەهەر کارێکی چاك کە قوتابی ئەنجامی دەدات ئەگەر هەواڵ بگەیەنرێتە ماڵی قوتابیەکە، دڵخۆشی دەکات و هانی دەدات بۆ ئەنجامدانی کاری زیاتر، بەلاَم دەبێت ئەم هەنگاوە لە رێگای بەرێوەبەری قوتابخانەوە ئەنجام بدرێت.

٨- هێنانە خوارەوەی نمرەی زیرەکی.

٩- بانگ کردنی و رێ نیشاندان و رێنمایی کردنی.

١٠- پشت تێکردن و گرینگی دان بە ئەوانی تر.

١١- گلەیی لێکردن و لۆمە کردنی.

١٢- ئاگادار کردنەوە و داوا کردنی واز هێنان لە کارەکە.

١٣- پچراندنی پەیوەندی بۆ چەند رۆژێك لەگەڵی.

١٤- گۆرینی شوێنی لادەر بۆ شوێنێك حەزی لێناکات بۆ ماوەیەکی کەم.

١٥- لێدانێکی سوك.

١٦- بانگ کردنی بۆ ژوورێکی تایبەت.

# بەشی سێ یەم
# پێویستیەکانی
# کەسایەتی مامۆستای سەرکەوتوو

## ١- هەبوونی پلانی کاری سالأنە و مانگانە و رۆژانە.

زانایانی بواری کارگێری لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە هەبوونی پلان یەکێکە لە خاڵە هەرە سەرەکیەکانی سەرکەوتنی هەموو پرۆژەیەك و هەموو کارێك، نەبوونی پلان واتا بێ سەروبەری و تێکەلأوبوون و بزربوونی سەرەداوەکان. بۆ هەموو کارێك پێویستە بزانین لە کوێ دەست پێدەکەین و دەمانەوێت بگەینە کوێ، ئەو رێگایانەشمان لەبەرچاوبێت کەپێیدا تێدەپەڕین، ئەگەر پلاندانان بۆکار گرنگ بێت ئەوا بۆ پەروەردەکردن و فێرکردنی مرۆڤ گرینگیەکەی زیاترە، مامۆستای سەرکەوتوو دەبێت بزانێت (کەی دەست پێدەکات و لە کوێ دەست پێدەکات وچ کاتێك تەواو دەبێت، رۆژانە و مانگانە چەندی مادەکەی دەگەیەنێ بە قوتابیان، لە رووی پەروەردەییەوە چی بۆ قوتابیان پێیە و دەیەوێت چۆن پەروەردەیان بکات............)

پلاندانان کارێکی گشتگیرو بەردەوامە کە مرۆڤ بەرنامە رێژی دەکات بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی. یاخود کۆمەڵێك کاری هزر و بیرە لەسەر رێگایەکی زانستی بۆ بەرز کردنەوەی ئاستی خواست. پلاندانان هۆکاری سەرکەوتنی هەموو کارێکە و رێگایەکە بۆ زیاد بوونی بەرهەم و گەیشتن بە خواستەکان. دیارە پلان دانانیش هەر لە بەرزترین یەکەی دەوڵەت تا بچوکترین دەزگا

پێویستیەکی سەرەکی یە و هەموو لایەك مارەسەی دەکەن. ئەم خاڵانەش گرنگی پلان دانان دەخەنە ڕوو.

١- ریزبەندی کارەکان لە گرنگترینەوە بۆ گرنگتر و پاشان بۆ گرنگ.

٢- سەرکەوتن مسۆگەرە و هەردەم لەبەر چاوە.

٣- بەئاسانی دەتوانین چاودێری کارەکان بکرێت و بەرهەمەکەی ببینرێت.

٤- کارەکان بەئاسایی خۆیان دەڕۆن و سەرمان لێتێك ناچێت.

٥- سود لە کات وەردەگرین و کارێکی زۆر بە ماوەیەکی کەم ئەنجام دەدەین.

٦- کارەکان کەڵەکە نابن و بێ سەروبەری لەکار دروست نابێ.

٧- توشی پێشهاتی لەناکاو نابیت.

٨- ئاسودەیی دەروونی دابین دەکات.

٩- هێزی مرۆڤ کۆ دەکاتەوە و بەباشی ئاراستەی دەکات.

١٠- یارمەتی دەرە بۆ سود وەرگرتن لە تەجروبەی کەسانی تر.

لەبەر بوونی ئەم خاڵانەی سەرەوە پێویستە مامۆستا هەموو ساڵێك نەخشە و پلانی تایبەت بەخۆی هەبێت و لەسەری بڕوات، خۆی دوور بگرێت لەهەموو ئەو قسە و توانجانە، کە لە گرنگی پلاندانان کەم دەکەنەوە و بە هۆیەوە مامۆستایان لە دانانی نەخشەو پلانی ساڵانە کەمتەرخەمی دەکەن و جێ بە جێی ناکەن.

## ٢- خوێندنەوە و خۆ رۆشنبیر کردنی بەردەوام

بنیادنان و دروستکردنی کەسایەتی تاك کارێکی ئاسان نیە، بەتایبەتی بۆ مرۆڤێك کە پێکهاتەیەکی ورد و ئاڵۆزی هەیە، هەندێك جار بە بچووکترین شت کاریگەر دەبێت و کەسایەتی لەرزۆك دەبێت و دەڕوخێت، جاری وەهاش وەکو شاخێك رووبەرووی سەخترین کێشەی ژیان دەبێتەوە و تێیدا خۆگر دەبێت و سەردەکەوێت. مرۆڤ بە شێکی هەست و سۆز و عەتف و خۆشەویستییە، بەشێکی تری عەقل و ژیری و فکرە، هەر لەو رۆژەی مرۆڤ دروست بووە و خۆی ناسیوە، زانایان و بیرمەندان و فەیلەسوفەکان، لەسەر ئەم دوو لایەنەی مرۆڤیان نووسیوە و لێکۆڵینەوەیان لەسەر ئەنجامداوە ، قوتابخانە گەلێك دروستبوون ، چەندین بیر و باوەڕی فەلسەفیان خستووەتە روو، بەلاَم تاوەکو ئێستا شەمەندەفەری لێکۆڵینەوەکان نەوەستاوە و بەردەوامە، بەو مانایەی لەگەڵ بوونی ئەو هەموو زانیاری و زانستە لەسەر پەروەردەی مرۆڤ، بەلاَم هێشتا مرۆڤەکان پێویستیان بە بیری نوێ و رێگای تر هەیە بۆ بنیادنانی کەسایەتی خۆیان.

ئەرکی مامۆستا راستەوخۆ تێکەڵ بوونە لەگەڵ تاك، لە قۆناغێکیش کە هێشتا مرۆڤەکان مادەیەکی خامن و هەویرێکی نەشێلدراون. بۆیە پێویستە مامۆستا لە هەموو کەس رۆشنبیرتر و خوێنەر تر بێت، شارەزاییەکی باشی هەبێت بە سەرجەم زانستەکان و زانستی (مرۆڤناسی)بە تایبەتی. لەگەڵ زانست و داهێنراوەکانی سەردەم بڕوات و لێی دانەبڕێت، بە مێژووی کۆن ئاشنا بێت و سودی لێوەربگرێت، خوێندنەوە بۆ مامۆستا وەك خواردن وایە بۆ جەستە، نەبوونی دووميان لەش لاواز دەکات، بەلاَم ئەمەی یەکەمیان عەقڵ

لاواز دەکات و ئاستی بیرکردنەوە و داهێنان تەسك دەکاتەوە.

جیاوازی مرۆڤ لەگەڵ دروست کراوەکانی تر بەتایبەتی لەگەڵ زیندەوەر و گیانلەبەرانی تر ئەوەیە، کە مرۆڤ خاوەن ژیر و عەقڵە. بەهۆی ئەم سیما تایبەتیەوە بووەتە گەورەی بوونەوەر و توانا و دەسەلاًتی هەیە بۆ لێکۆلینەوە و گەران لە بوونەوەردا. هەموو شتێك کە سیمای گەشە کردنی هەبێت پێویستی بە جۆرێك لە خواردن هەیە، خواردنی عەقڵیش خوێندنەوەیە، هەر کاتێك خوێندنەوە هەبوو، بیر و هۆشی مرۆڤ گەشە دەکات و کارا دەبێت و زەمینەیەکی لەبار دەرەخسێت بۆ فێر بوونی زانست و ئەنجام دانی داهێنانکاری، بەلاًم بە پێچەوانەوە، نەخوێندنەوە مرۆڤ توشی بێ تاقەتی و بێ توانایی لەبیرکردنەوە و رق لێبونەوە لە وەرگرتنی زانست دەکات و توانای داهێنان کاری لاواز دەکات، گەلێك جاریش کاریگەری لەسەر دەروونی تاك دروست دەکات و بە خوێندنەوەیەکی کەم تووشی سەر ئێشەیەکی توندی دەکات. بۆیە یەکەم فەرمانێك خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆز ئاراستەی مرۆڤەکان دەکات بریتیە لە خوێندنەوە ( اقرا). هاتنەخوارەوەی ئەم ووشەیە وەکو یەکەم وشەی قورئان، خۆی لە خۆیدا مانا و مەغزایەکی تایبەتی و فراوانی هەیە، کە پێویستە مرۆڤی ژیر هەڵوێستەیەکی قوڵی لەبەرامبەر بکات.

لێکۆلینەوە زانستیەکان دەریان خستووە، کە ( ٧٠٪ )ی ئەو زانیاری و زانستانەی مرۆڤ لە ژیاندا فێریان دەبێت، لە رێگای خوێندنەوەیە، بەشەکەی تری لە رێگای بیرکردنەوە و پرسیار کردن و گوێگرتنەوە و تاقیکارییەوە فێردەبێت. لە رێگای راپرسیشەوە ئەوە سەلماوە، کە مرۆڤەکان ئەوەندەی لە رێگای خوێندنەوەوە فێر دەبن، زۆر زیاترە لەوەی کە لە قوتابخانە فێری دەبێت.

# گرنگی خوێندنەوە

١- خەزێنەیەکی گەورەی زانیاری لە مێشکی مرۆڤ کۆدەبێتەوە و دەتوانرێت بکرێتە دەربڕینی جوان و قسەی بەسود بۆ خەڵك.

٢-خۆ رزگار کردن لە نەفامی و نەزانی.

٣- گەشە پێدانی بیر و هۆشی و چالاك کردنی.

٤- ئاسودەیی و هێمنی و ئارامی دەروونی بە مرۆڤ دەبەخشێ.

٥- تێگەیشتنێکی جوان و ورد بۆ مانای ژیان دروست دەکات .

٦- خۆراکێکە بۆ ژیر و عەقلی مرۆڤ.

٧- پەیوەندیە کۆمەلأیەتیەکان بەهێز دەکات و سەرکەوتنی پێدەبەخشێت.

٨- خوێندنەوە ، گەشتێکی ناوازەیە بۆ رابردوو.

٩- فراوان بوونی ژیان لە بەردەم مرۆڤ.

١٠- نزیك بوونەوەو هاورێیەتی کردنە لەگەڵ پیاوچاکان و زانا و بلیمەتەکانە.

# رۆشنبیرو رۆشنبیربوون

رۆشنبیرو رۆشنبیربوون یەکێکە لەو بابەتە زیندووانەی کە ئەمرۆ وەك فاکتەرێکی سەرەکی و گرنگ بۆ گەشە کردن و پێشکەوتنی میللەتان و سەرکەوتنی هەر بیر و بۆچونێك وەك پێویستیەکی سەردەمی بە گرنگ دادەنرێت ، چونکە ئەمڕۆ رۆشنبیری بووەتە بە شێك لە ژیانی هەموو تاکێکی ناو کۆمەڵگا، بۆ ئەوەی شارەزایی تەواوی بەسەر بارودۆخی دەوروبەریدا هەبێت و بە ساکاری بەسەر شتەکان گوزەر نەکات و بتوانێ گۆڕانکاری بخولقێنێ.

# رۆشنبیر کێ یە؟

**وشەی رۆشنبیر لە زمانەوانی عەرەبیدا چەند مانایەکی هەیە**

**١- دەرك پێکردنی شت و وەرگرتنی .**

**٢- گەشەپێدانی هزرو لێهاتووییەکان.**

**رۆشنبیر بەمانا گشتی یەکەی واتە (بریتیە لە کۆی ئەو زانست و مەعریفە و هونەرانەی کە پێویست دەکات باش دەرکبکرێن). (تثقیف) واتە (رێکسازی و راستکردنەوەی شتەکان و رێنوێنی خەڵکانی تر بە هۆی ئەو رۆشنبیرەوە). لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مرۆڤی رۆشنبیر بریتیە لە مرۆڤێکی بیرتیژ و وریا و بە ئەزمون و خاوەن هزر و هۆش و چالاك، کە زوو هەست بە شتەکان دەکات و دەیان خوێنێتەوە. رۆشنبیری هەر کۆمەڵگەیەکیش بریتیە لە کۆی سەرجەم تاکە رۆشنبیرەکانی ئەو میللەتە، لە رووی ئاینی و کەلتوری و ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی. رۆشنبیریش نەك تەنها بۆ ماموستا بەڵکو بۆ هەموو تاکێکی کۆمەڵگا گرنگە چونکە.**

**١-مرۆڤی رۆشنبیر خۆی دەناسێ و دەزانێ لە چ ئاستێکدایە، ئەرك و مافەکانی خۆی دەزانێت و لە ژیان نائومێد نابێت و دڵخۆشی دەدات بە دەورو بەرەکەی خۆی.**

**٢- مرۆڤی رۆشنبیر پێش کەسانی تر دەرك بە شتەکان دەکات و دۆست و دوژمنی خۆی دەناسێ، زوو هەڵنا خەڵەتێ.**

**٣- رێز لە کلتوری نەتەوەکەی خۆی دەگرێت.**

**٤- مرۆڤی رۆشنبیر کەسێکی ئازادی خوازە و روو بە رووی خراپە و چەوساندنەوە دەبێتەوە و بەرگری لە مافەکانی بێ دەسەڵاتان دەکات و**

دەنگیان دەگەیەنێتە ناوەندەکانی بڕیار.

لێرەشدا بە پێچەوانەوە نەبوونی ڕۆشنبیری کەسایەتی لاواز دروست دەکات و چەند زیانێکی بۆ کۆمەڵگا هەیە.

١- کەمی زانیاری و زانست دەربارەی ڕووداوەکانی ڕۆژانە.

٢- دەبێتە هۆی خەم بچوکی و خۆبەگەورە زانین و بێ سودی و تێنەگەیشتن لە بەرامبەر.

٣- زوو هەڵخەڵتان لەبەردەم فێڵی دوژمن و سەرسام بووم بە شارستانیەتی میللەتانی تر و هێنانی بۆ ناو میللەتەکەیی و بێ ڕێز سەیرکردنی شارستانیەتی میللەتی خۆی.

ڕۆشنبیری وەك سەرجەم پێویستیەکانی تری ژیان پێویستە لە کەسایەتی سەرجەم تاکەکانی کۆمەڵگا هەبێت، بە تایبەتی بۆ کەسایەتی مامۆستا پێویستیەکی حاشا هەڵنەگرە، بەتایبەتی شالأوی جیهانی ئەمڕۆ و قورسی ئەرکی سەرشانی، ئەم لایەنەیان زیاتر پێویست کردووە.

# ٣- ناسین و شارەزایی لە قۆناغی هەرزەکاری

قۆناغی هەرزەکاری کەتیایدا مرۆڤ  منداڵی خۆی تێدەپەڕێنێ و بەرەو قۆناغی کامل بوون دەچێت، ترسناکترین قۆناغی مرۆڤە، ماوەیەکە کە دەتوانین لاوێکی سودمەندو هۆشیار پێبگەیەنین، تاوەکو سودی هەبێت بۆ خاك و خەڵك، سەرکەوتن لە بنیاد نانی ئەوان سەرکەوتنە لە دروستکردنی داهاتوویەکی گەش و روون، ئەرکی مامۆستایە وەك پەروەرشیارێك ئەم کانزا بەنرخە بناسێت و بەرەو ئاراستەیەکی دروستی ببات، لە رووی عەقلی و دەروونی و کۆمەڵایەتی و جەستەیی و ئاینی و رەوشتیەوە پەروەردەی بکات. پێویستە بە چاوی بەزەیی سەیری بکەین و لە ئازارەکانی بگەین و یارمەتی بدەین بۆ زاڵبوون بەسەر کێشەکانی.

## گرفتەکانی هەرزەکار:

١- لە جەستەو لاشەدا مرۆڤێکی تەواوە بەڵام لە بیرکردنەوە منداڵانەیە، پێویستە هەنگاو بەهەنگا، هۆشیاری بکەینەوە تاوەکو ئاستی بیرکردنەوەشی پێدەگات،  نابێت کەسایەتی بشکێنین و خۆمانی لێتوڕە بکەین.

٢- هەمیشە بیری لای خۆیەتی کە بۆچی کێشی زیادی کردووە و گۆڕانکاری جەستەیی خێرایە و شتی تازە لەسەر لاشەی پەیدا دەبێ، پەروەرشیار دەبێت ئەم دیاردانەی لەلا بچووك و ئاسایی بکاتەوە، فێری بکات کە ئەوانە شتی لاوەکین، کاری مرۆڤ ئەوەیە کە بۆ داهاتوو، خۆی پێبگەیەنێت و بیر لە دوارۆژ بکاتەوە.

٣- هەرزەکار زۆر حەزناکات بڕیار بەسەریدا بسەپێندرێت، هەر بۆیە نابێت زۆر رستەی داخوازی لەگەڵی بەکار بهێنین.

٤- ژیانی هەموو خۆزگە و ئاواتە، کە زۆربەیان لەگەل واقعی ژیان ناگونجیٚ، دەبێت فێری دیاری کردنی ئامانجەکانی ژیان بکرێت و پێویستی و کەرستەکانی هێنانەدی بۆ روونبکرێتەوە.

٥- تەنها باوەڕی بە بڕیارەکانی خۆی هەیە، رەتکردنەوەی قسەی بەرامبەر بە بەهێزی خۆی دەزانیٚ، دەبێت فێری بکەین (بەڵیٚ) کردن و (نازانم) لە کەسایەتی مرۆڤ کەم ناکاتەوە، نابێت بریاربدەین بەبیٚ بیرکردنەوە، پاشگەزبوونەوە و دان نان بە هەڵە هیچ عەیبێکی تێدانیە.

٦- هەستی خۆشەویستی بە هێزە بەتایبەتی بۆ جنسی بەرامبەر، دەبێت خۆشەویستی و جۆرەکانی خۆشەویستی بۆ شی بکرێتە و فێری خۆشەویستی راستەقینە بکرێت.

٧-هەردەم لەناو کێشەدا دەژیت و هیچ چارەیەکی لا نیە، پێویستە بەردەوام دەستی یارمەتی بۆ درێژبکرێت، پێویستە تێی بگەیەنین کە بەهاوکاری یەکتری و پرس پێککردن، دەتوانین تەواوی کێشەکان چارەسەر بکەین .

٨- هەمیشە خەریکی خۆیەتی و بەردەوامیش لە خۆی نارازییە، فێری بکەین مرۆڤ خۆی خۆی دروست نەکردووە، هەموو کەسێك ناتەواوی تێدایە، گرنگ ئەوەیە لە ژیان رەوشتمان جوان بێت و هەوڵی سەرکەوتن بدەین.

٩- حەز بە پێکەنین دەکات ئەگەر بەبیٚ هۆش بێت، بە شتێکی ئاسایی وەریبگرین و لۆمەی نەکەین و بە پێدانی ئەرك و کاری سووك سەرقاڵی بکەین.

١٠- بەردەوام ماندووە و دڵەراوکێی زۆرە بۆ داهاتووی خۆی،پێویستە کاتی حەسانەوەی بۆ زۆر بکەین و ئەرکی سەرشانی قورس نەکەین، نموونەی خەڵکی سەرکەوتووی نیشان بدەین و رێگاکانی سەرکەوتنی بۆ رۆشن بکەینەوە.

## ٤- شارەزایی لە هونەری سەرکردایەتی

یەكێك لە ئەرکە سەرەکیەکانی مامۆستا سەرکردایەتی کردنە، چونکە هەر كەسێك هێز و توانای خۆی بەکارهێنا بۆ ئەوەی خەڵك رێك بخات و ئاراستەیان بکات بەرەو ئەو ئامانجەی کە خۆی دەیەوێت، پێی دەگوترێت سەرکردە. سەرکردایەتی کردنیش هونەرێکە پێویستە بیزانین و شارەزاییمان لێی هەبێت. بۆیە هەندێ لە خاڵە گرنگەکانی کەسایەتی سەرکردە دەخەینە روو.

١- باوەڕێکی تەواوی بەکارەکەی خۆی هەیە، دڵئارام و دەروون ئاسوودەیە، دوودل و ڕاڕا نیە.

٢- پێشەوای خەڵکە لە کەسایەتی و ئاستی رۆشنبیری دا.

٣- سەرکردە کەسێکە هەوڵدەدات لە چوارچێوەی کارەکەی خۆی یەکەم کەس بێت و کەسی تر لەو شارەزاتر و زیرەکتر نەبێ.

٤- پەیوەندی کۆمەڵایەتی بەهێزە و هەڵسوکەوتی راستگۆیانەیە، خەڵك پێویستیان پێیەتی و پرسی پێدەکەن.

٥-باوەڕی بەخۆی هەیە و ترسی لەکارکردن نیە، بە پێکەنینەوە پێشوازی لێدەکات.

٦- بیرکردنەوەیەکی قوڵی هەیە ، بۆ کێشەکان دادەنیشێت و بەدوای رێگا چارە دەگەڕێت و بەپەلە بڕیار نادات.

٧-کێشەکان لە ئاستی خۆیان گەورەتر ناکات و کاری خۆی بەکەس ناسپێرێ.

٨- کەسێکی ورییایە، لە دەوروبەری خۆی توانای کۆکردنەوەی زانیاری زۆری هەیە و لێکیان دەداتەوە.

٩- خـاوەن دیدگایـەکی فراوانـە و هـەموو کـەس دەبینێـت و بـۆ بەرامبـەر گوێگرە و مافی قسەکردنیان دەدات.

١٠- توانای بڕیاردانی بەهێزە.

١١-هێمن و لێبووردەیە، لۆمەکەر و رووخێنەر نیە.

## ٥- هونەری مامەڵە کردن لەگەڵ بەرامبەر.

هونـەری ناسـینی بەرامبـەر و مامەڵـەکردن لەگەڵیـدا، بـۆ مامۆسـتا زۆر گرنگـە، چـونکە پیشـەکەی راسـتەوخۆ پەیوەنـدی بـە مرۆڤـەوە هەیـە، فێریـان دەکـات و دەسـتکاری رەوشـت و جوولـەو گوفتاریـان دەکـات، مرۆڤـەکانیش یـەك جـۆر نـین لـە بیرکردنـەوە و هەڵسوکەوت کـردن، هەریەکـەیان بـە شـێوەیەك فێردەبێـت و تێـدەگات، (هەیانـە نەرمـە هەیانـە توندوتیـژە، هەیانـە بێدەنگـە هەیانـــە ئـــاژاوە چـــی یـــە، هەیانـــە گـــوێگرە، هەیانـــە بـــەرەوڕووت دەبێتەوە.............هتـد). هـەموو مـرۆڤێکیش پێویسـتە فێربکرێـت و بـەرەو چـاکە ئاراسـتە بکرێـت، نابێـت کۆمـەڵێك فێربکـەین و پشـت لـە هەنـدێکیان بکەین. گرنـگ ئەوەیە بەرامبـەرەکەی خۆمـان بناسـین و بـە شـێوەیەکی راسـت و دروست مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین.

بۆ ئەوەی لەگەڵ قوتابی سەرکەوتوو بیت، پێویسـتە ئەوشـتە بـە قوتـابی بدرێت کـە خـۆی پێـی خۆشـە و خـۆی دەیـەوێت، نـەوەك ئـەو شـتەی مامۆسـتا خۆی پێی خۆشە،یەکێك لە نووسەرە بەناوبانگەکان بەناوی (دایل کارینجی) لـە بابەتێکی خۆیدا دەگێڕێتە و دەڵێت (زۆر حەزم لە ماسی گرتن دەکـرد, هـەموو ئەو خواردنە خۆشانەی کە خۆم پێم خۆش بوو، لەگەشتەکەم هێنابووم لەگـەڵ

خـۆم، دەمکـرد بـە قـولابی ماسـی گرەکـەوە، بـەلاَم هـیچ ماسـییەکم بـۆ نـەگیرا، پاشان بیرم کردەوە من دەبێت بۆ گرتنی ماسی ئـەو خواردنـە بکـەم بـە قـولابی ماسی گرتن کە ماسی خۆی پێـی خۆشـە نـەك مـن، بۆیـە هەنـدێ کـرمم پەیـدا کردوو کردم بە قولابەکەوە و دەستم کرد بە ماسی گرتن)، مرۆڤەکانیش، هـەر بـەم شـێوەیەن، کاتێـك دەتوانیـت سـەرنجی بەرامبـەر رابکێشـیت، ئەگـەر ئـەو شتەیان پێ بدەیت کە خۆیان پێیان خۆشە.

## ئەو شتانە چین کە کەسی بەرامبەر پێی خۆشە.

١- کەس حەزناکات ئامۆژگاری بکرێت لە ناو کۆمەڵێك خەڵك.

٢- خەڵك حەز دەکەن ئەگەر هەڵەت کرد، دان بە هەڵەکەت دابنێیت.

٣- خۆت بەگەورە مەزانـە، چـونکە بەرامبـەر هەسـت دەکـەن تـۆ بچـوکیان دەکەیتەوە.

٤- خراپەی خەڵك بەبیر خەڵك مەهێنەوە.

٥- دەستەواژەی( تۆ هەڵەی) ,( خەتای تۆ بوو) بەکار مەهێنە.

٦- بە گرینگی پێدانەوە لە بەرامبەر بڕوانە.

٧- بەدەم پێداویستی خەڵك برۆ و هاوکاریان پێشکەش بکە.

٨- چاکەی بەرامبەر بۆ خەڵك باس بکە .

٩- هانی بەرامبەر بدە و دیاریان پێشکەش بکە.

١٠- بە زەردەخەنەوە بۆ بەرامبەر بڕوانە.

# شارەزایانی

## بواری زانستی دەروونناسی گوێگریان کردووەتە چەند دەستەیەك.

١- کەسی ناڕازی:

خاوەن کەسایەتیەکی شەرانگێزە، بە زۆر پرسیارکردن رووبەڕووت دەبێتەوە، بەردەوام کێشە دەخولقێنێ، قسەزانە.

هەڵسوکەوت لەگەڵیان

دەبێت هێمن بین و هەڵنەچین، خۆت بەبەهێز بزانە لەبەرامبەری، قوتابی تر بهێنە ناو بابەتەکە و بەشداریان پێبکە.

٢- کەسی هاوارکەرو بەگارەگار:

زۆربەیان زانیاریان هەیە لەسەر بابەتەکە،حەزی لە بەشداری کردنە، هەست بەوە دەکات مامۆستا پشتگوێی خستووە.

هەڵسوکەوت لەگەڵیان

شکانەوە و سەرکۆنەکردن بۆ ئەمانە باش نیە، بە پرسیاری گران بەشداری پێبکە، بە نەرمی داوای لێبکە دانیشێت.

٣- کەسی دەمامکاوی:

ناتوانێت بۆچوونەکانی خۆی بە جوانی دەربڕێت، پێویستی بەیارمەتیە،ڕاڕاو دوودڵە.

هەڵسوکەوت لەگەڵیان

پێویستە دەربڕینەکانی بۆ راست بکرێتەوە و پێی دووبارەبکرێتەوە،هانبدرێت و دەستخۆشی لێبکرێت.

٤- کەسی راڤەکەر:

زۆر بەدوای شتدا دەروات، لەوانەیە مەبەستی بێزارکردنی بەرامبەر بێت، دەخوازێت بەرامبەرەکەی بخاتە ناو بڕیارێکی هەڵەوە، یان بەدوای ئامۆژگاریدا دەگەڕێت.

<u>هەڵسوکەوت لەگەڵیان</u>

لەگەڵی پێدانەچین و هەوڵی چارەسەری گرفتەکەی نەدەین، بڕیارێکی یەکلاکەرەوەی نەخەینە دەست، قوتابی تر لە گفتوگۆکە بەشداری پێبکەین.

٥- کەسی بێدەنگ:

بەشداریکەر نیە، خۆی بەگەورە دەزانێ، بێتاقەتە، بیری لەدەرەوەی پۆلە.

<u>هەڵسوکەوت لەگەڵیان</u>

پرسیاری لێبکە دەربارەی بۆچوونی خۆی، بۆ شیکردنەوەی راهێنان هەلیبسێنە،سوپاسی بکە بۆ بەشداریەکەی.

٦- کەسی عیناد.

لە بۆچوونەکانی خۆی دانابەزێ، خۆپەرستە، قسەی بەرامبەر وەرناگرێت.

<u>هەڵسوکەوت لەگەڵیان</u>

بۆچوونەکانی بکە بە خاڵی گفتوگۆ لەگەڵ قوتابییەکانی تر، پێی بڵێ کە کات کەمە و بەش ناکات، داوای لێبکە گقتوگۆکانی بۆ دەرفەتێکی تر هەڵبگرێت.

٧- کەسی خاوەن قسەی لابەلا:

لەوانەیە بخوازێت روونکردنەوە بدات، لەسەر شتی لابەلا و دوور لەبابەت قسە دەکات، بەبێ مۆڵەت وەرگرتن هەڵدەستێ.

<u>هەڵسوکەوت لەگەڵیان</u>

بەسەرەخۆ مەیشکێنەوە، بیهێنەوە بۆ ناو بابەتەکە بەبێ ئەوەی هەست بکات، پێی بڵێ با بۆچوونی خۆی دەرببڕێت.

٨- کەسی نەرم و نیان:

شەرم بەسەریدا زاڵە، داوای لێبووردن زۆر دەکات، زۆربەیان زیرەکن، هاوکاری کەرە.

هەڵسوکەوت لەگەڵیان

بە چاکە باسی بکە لای هاورێکانی، پشتگوێی مەخە و پرسیاری ئاراستە بکە، ببە بە هاورێیەکی چاك بۆی.

٩- کەسی لووت بەرز:

دەم بەهاوارە، گوێگرێکی باش نیە، تانە زۆر دەدەت، بەرامبەر دەشکێنێتەوە.

هەڵسوکەوت لەگەڵیان

چاوت بەردەوام لەسەر بێت، پرسیاری قورسی ئاراستە بکە، هەندێ جار دەرکردنی لە پۆل باشە.



# ٦- شارەزایی لە ڕێگاکانی وانە گووتنەوە

ڕێگاکـان و شـێوازی وانـە گووتنـەوە، لـە ئـامرازە گرنگـەکانی پرۆسـەی فێربوونە. هەموو ئـەو پرۆگـرام و بەرنامـە و ئامادەکارییـەی کـە لـە سـەرەتاوە دەکرێت و داهات و ماندوو بـوونێکی زۆری لێ خـەرج دەکرێـت، سـەرەنجامەکەی دەکەوێتە دەست مامۆستا، ئـەویش بـە ڕێگایـەك لـە ڕێگاکـان دەیگەیـەنێت، جا ئەگەر ڕێگاکە گونجاو بوو، ئەوا ماندوو بوونەکە بە فیڕۆ ناڕوات و ئامانجـەکانی پـەروەردە دێنـە دی، بـەڵام بـە پێچـەوانەوە ئەگـەر ئـەو ڕێگایـەی کـە مامۆسـتا بـەکاری هێنـاوە گونجـاو نـەبوو، لـە هـەمان کاتـدا ئامـانجی خـۆی نـەپێکا، ئـەوا تـەواوی پـلان و نەخشـە و هەوڵـەکانی حکومـەت و وەزارەتـی پـەروەردە، بـێ بەرهـەم دەبێـت و ئـەو ئامانجـەی دیـاری کـراوە مەبەسـتی خـۆی ناپێکێـت، دەتوانین بڵێین هەموو لایەك سەیری ئـەو (٤٥) دەقیقەیـە دەکـەن کـە مامۆسـتا دەچێتە پۆل، ئەویش وەسـتاوە لەسـەر ئـەو ڕێگایـەی کـە مامۆسـتا خـۆی هـەڵی دەبژێرێت و قەناعەتی پێی هەیە و ناتوانرێت بـە سـەریدا بسـەپێنرێت، بـەڵام ڕێگاکە هەرچیەك بێت دەبێت زانستی بێـت و لـە ئاسـتی تێگەیشـتنی قوتابیـان بێـت و ئـەو ڕێگایـە بێـت کـە پـەروەردە قبـوڵی بکـات، کەواتـە ڕێگاکـانی وانـە گووتنەوە و شێوازی دەربڕین، دوو خاڵی بنچینەیی پرۆسەی فێربوونە. زۆرێك لە مامۆستایان ڕێگاکانی وانەگووتنـەوە و شـێوازی وانـە گووتنـەوە بەیـەك شـت لەقەڵەم دەدەن، بەڵام لە ڕاستی دا ئەم دووانە دوو شتی لێك جیاوازن.

**ڕێگاگـــانی وانـــە گووتنـــەوە:** ئـەو شـێوە کردارەیـە کـە مامۆسـتا بـە هۆیـەوە زانیارییەکەی دەگەیەنێتە قوتابی، واتە ڕێگایەکە بۆ گەیاندنی زانیاری.

**شـــێوازەکانی وانـــە گووتنـــەوە:** ئـەو جـۆرە جـولان و هـەڵس و کـەوتو قسـەو

دەربڕینانەیە، کە مامۆستا دەیان کات و دەریان دەبڕێت، لە کاتی شیکردنەوەی وانەکەدا، جا ئەم شێوازە توند و تیژ و ترسێنەرە یاخود رووخۆش و قسە خۆش و دەم بە خەندەیە، روون و رۆشنە یاخود ئاڵۆز و تێکەڵە، خاو و بێزار کەرە یاخود گەرم و گوڕ و سەرنج راکێشە............هتد .

## رێگاکانی وانە گووتنەوە

ئاشکرایە زانایانی بواری پەروەردە و فێرکردن لە کۆنەوە تاوەکو ئێستا، ئاماژەیان بە چەندین رێگا کردووە، کە لە خوارەوە بەکورتی هەندێکیان دەخەینە روو:

١- رێگای وتاردان ( **طريقةالمحاضرة** )

لەگەل چوونە ژوورەوە بۆ ناو پۆل مامۆستا دەستدەکات بە وانە گووتنەوە و شیکردنەوەی بابەتەکە، بە بێ بەشداری قوتابی زانیارییەکان دەخاتە روو، دەنووسێت و لەسەر تەختە رەش زانیارییەکان تۆمار دەکات، قوتابی لە نووسین و شیکردنەوە و مناقەشە کردن هیچ رۆڵێکی نیە.

٢- رێگای پرسیار کردن ( **طريقة الأسئلة** )

ئەم رێگایە لەوە خۆی دەبینێتەوە کە مامۆستا چووە ژوورەوە، کۆمەڵێك پرسیاری ئامادەیە، یەکە یەکە پرسیارەکان ئاراستەی قوتابیان دەکات و ئەوانیش وەلأم دەدەنەوە، لەم رێگایە مامۆستا لە شیکردنەوەی وانەکە، کەم بەشدار دەبێت، زیاتر قوتابی وانەکە ئامادە دەکات و لە رێگای پرسیارەکانی مامۆستاوە وەلأم دەداتەوە، ئەم رێگایە زۆر لە کۆنەوە بوونی هەیە و رێژەیەکی زۆر لە مامۆستایان پەیڕەوی لێ دەکەن.

٣- ڕێگای گفتوگۆ ( **طريقة المناقشة** )

ئەم ڕێگایە یەکێکە لە ڕێگا هەرە کۆن و هەرە گرنگەکان، هەندێك لە مێژوونووسان دەیگێڕنەوە بۆ سەردەمی(سوقرات)، لەم ڕێگایەدا پرسیار کردن ڕۆڵێکی گرنگی هەیە، بەلاّم نابێتە ئامانج و بنەمای سەرەکی، بەڵکو گفتوگۆی هێمن و لەسەرخۆ لە نێوان ماموٚستا و قوتابی، قوتابی و قوتابی، ئامانجی سەرەکیە، بەمەش تەنها ماموٚستا بەشدار نابێ لە شیکردنەوەی وانەکە یاخود تەنها قوتابی وەلاّم بداتەوە، بەڵکو هەردوو لا بەیەکەوە پرسیار دەکەن و مناقەشەی دەکەن، تاوەکو دەگەنە ئامانج و مەبەستی خۆیان.

٤- شێوازی گرووپ (**طريقة المجموعة** )

ئەم ڕێگایە لەم سەردەمەدا زۆر باوە ، لە زۆربەی ولاّتە پێشکەوتووەکان پەیڕەوی لێ دەکرێت، چەند ساڵێکە ولاّتانی تازە پێگەیشتوو بە هەرێمی کوردستانیشەوە، بە شێوەیەکی کەم و سنووردار پەیڕەو دەکرێت، لەم ڕێگایە پۆل دەکرێتە چەند گرووپێك، قوتابیەکی ئاست بەرز و زیرەك سەرپەرشتی گرووپەکە دەکات و یارمەتی قوتابیە ئاست نزمەکان دەدات، بەمەش گیانی هاوکاری لە پۆلدا بە هێز دەبێت و ئاستی قوتابیەکان لە یەکتر نزیك دەبێتەوە.

٥- ڕێگای پرۆژە( **طريقة المشروع** )

ئەم ڕێگایە لە ڕێگا هەرە تازە و پێشکەوتووەکانە، لە زۆرێك لە وولاّتە پێشکەوتووەکان پەیڕەو دەکرێت، بەتایبەتی وولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، ئەم ڕێگایەش بریتیە لەوەی کە قوتابی خۆی بەدواداچوون دەکات و پلان دادەنێت و پرۆژە پێشکەش دەکات، زانیاری کۆ دەکاتەوە و دەنووسێت و جێ بە

جێ دەکات، بەمەش قوتابی کەسی یەکەمە و ئاستی فکری و بیرکردنـەوەی لـەو پــەڕی بــەهێزی و ئامــادە باشــی دایــە، ڕۆڵــی مامۆســتا تــەنها چــاودێری و ئاسانکارییە.

٦- ڕێگای چیرۆك ( **طريقة القصة** )

پێشـکەش کردنــی زانیــاری لــە ڕێگــای گێرانــەوەی چــیرۆکێك دەبێــت، بــە مەرجێك چیرۆکەکە لە بابەتەکەوە نزیك بێت، زانایـان بـە ڕێگایـەکی تەقلیـدی و دواکــەوتووی دادەنــێن، بۆیــە کەوتۆتــە بــەر ڕەخنــە و تــوانجێکی زۆر، ئــەم ڕێگایـەش زۆربـەی جـار بـۆ گەیانـدنی زانیـاری بـەکاردێن بـۆ منـداڵ، چـونکە سەرنجی منداڵ کێش دەکات و بەو هۆیەوە فێری چەندان زانیاری دەبێت.

٧- ڕێگای گەڕان و ڕاهێنانی زانستی (**طريقة التدريب العلمي** )

لەم ڕێگایە گەڕان و ڕاهێنـانی زانسـتی پیشاندانی نەخشـە و چـوون بـۆ شـوێن و واقعــە ڕاســتەقینەکە لــە ڕێگــای گەشــت کــردن، ئــەم ڕێگایــە بــەزۆری بــۆ بابەتەکانی جوگرافیا و مێژوو دەبێت، ڕاستەوخۆ قوتابی دەچێتە ناوجەرگـەی شوێنی ڕووداوەکە، بەمەش کۆمەلێك پرسیاری گرنگـی بـۆ دروسـت دەبێـت، کـە پێویست دەکات مامۆستا ڕاستەوخۆ وەڵامی بداتەوە.

## ٧- هونەری دەربڕین

پیاوێك خاوەنی کلیلێکە، ئەم کلیلەش هی خەزێنەیەکی گەورەی پڕ گەوهەرە. ئەمە گرنگ نیە..! گرنگ ئەوەیە بزانێت چۆن بەم کلیلە دەرگای خەزێنەکەی دەکاتەوە، زیرەکی مامۆستا ئەوە نیە وانەکەی هەموو لەبەر بێت و زانیاری زۆری لەلا بێت، زیرەکی ئەوەیە بتوانێت ئەو زانست و زانیاریانە بگەیەنێتە قوتابی و لێی وەربگرێت و سودی لێ ببینێت.ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر شێوازی دەربرین

مامۆستایەکی ئاینی بە گێرانەوەی فەرموودەیەك خەڵك توشی خەوبردنەوە دەکات، بەلاّم هەمان فەرموودە لای مامۆستایەکی تری ئاینی خەڵکەکە بەگریان دێنیّ، هونەری دەربڕین وەکو سیحر وایە دەتوانین بەهۆیەوە خەڵك بۆلای خۆمان کێش بکەین. بۆئەوەی دەربڕینەکانمان کاریگەریان هەبێت، پێویستە ئەم خالاّنە لەبەرچاو بگرین.

١- بابەتەکەمان دیاری کردبێت و ئامادەمان کردبێت و زانیاریمان لەسەر کۆکردبێتەوە.
٢- زمانمان پاراو بکەین بە وشەی جوان و ناسك و سەرنجراکێش،ئەویش بە خوێندنەوەی بەردەوام.
٣- بابەتەکە دەست پێنەکەین تاوەکو دڵنیا نەبین کە گوێگر(قوتابی) ئامادەیە بۆ وەرگرتن.
٤- دەست پێکردن بە روویەکی خۆش و سەرنجراکێش.
٥- تێکەڵ کردنی نموونە و رووداوی کورت و سەرنجراکێش بە بابەتەکە.
٦- بەشداری پێکردنی بەرامبەر لە گوتنەوەی بابەتەکە بە پرسیار لێکردنی.

٧- بیر روونی و تێکەڵ نەکردن و دەرنەچوون لە سنوری بابەتەکە.

٨- خۆ رێکخستن لەشێوە و جل و بەرگ و وەستان لە شوێنی شیاو.

٩- بەتاڵکردنــەوەی هەنــدێ وزە و توانــای زیــادی لــەش، ئــەویش بــە خــۆ هێمنکردنەوە و هەڵکێشانی هەناسەیەکی قوڵ.

١٠- ئامادەکردنی پێداویستیەکانی خۆت لە پۆل.

١١- گۆڕینی دەنگ و وریایی لەجولاندنی ئەندامەکانی لەش.

١٢- تێگەیشتن لـە هەسـتی بەرامبـەر و هێنانـەوەیان و کێشـکردنەوەیان بـۆ نـاو بابەتەکە.

١٣- پابەندبوون و رێزگرتن لەکات.

١٤- ناسینی ئاستی قوتابیان و قسە کردن لە ئاسـتی ئـەوان و دوور کەوتنـەوە لە بەرز و نزم کردنەوەی ئاستی دەنگ.

١٥- وەلاّم دانەوەی پرسیارەکان و دوورنە کەوتنەوە لێی.

# ٨-هونەری پەیوەندییەکان

مامۆستا نابێت کەسێکی داخـراو و دوورەپـەرێز بێـت، بـەڵکو پێویستە هەمیشـە پەیوەندییـەکی بـەهێزی لەگـەڵ دەوروبـەر هـەبێت، بـۆ ئەمـەش پێویسـتی یـەکی زۆری دەبێـت بـە زانـین و ناسـینی هونـەری پەیوەندییـەکان، گرینگـی و بایـەخ پێـدان بـەم هونـەرە زیرەکـی و هۆشـیارییەکی زۆر بـە خاوەنەکەی دەبەخشێت.

زانایـانی بـواری پەیوەندییـەکان گـەلێك پێناسـەی جیاوازیـان بـۆ ئـەم چەمکە کردووە، هەمووشیان گرنگی هونەرەکە دەردەخەن، ئێمە تـەنها چەند پێناسـەیەك دەخەینـە روو،زانـا هـوارد بونهـام دەڵـێ( پەیوەندیـەکان ئـەو هونەرەیـە کـە پـەرە بـە تێگەیشتنەکان دەدات لـە پێنـاو چەسپاندنی زیـاتر بنـەمای بـاوەر بـە یـەکتر کـردن)، لـە قوتابخانـەی فەرەنسـی وا پێناسـە کـراوە (چـالاکیەکە ئامـانجی کـاری خێـرە و هۆشـیارکردنەوەی خەڵکـە)، بـول جاریـت دەڵـێ (پەیوەندییـەکان تێکۆشـانێکی بەردەوامـە لـە رووی ئیداریـەوە بـۆ پەیـدا کردنـی متمانـەی خـەڵك)، دەبێـت ئـەوەش بـزانین کـە ژیـانی پێغەمبـەر بنیـاد نـرابـوو لەسـەر پـەرەدان بـە پەیوەندییـەکان لەسـەر ئاسـتی تـاك و کۆمـەڵگا بـۆ گەیاندن و بلاوکردنەوەی پەیامەکەی .

هونەری پەیوەندییەکان زانستە و هونەرێکی نوێی سەردەمە و دیاردەیـەکی بەرزی شارستانیەتە و خۆی لە هەموو بوارەکانی ژیانی مرۆڤ دەنوێنێت، کـار و هونەرێکی خزمەتگوزاری و وەسـتایانەیە، بـە مەبەسـتی گرێـدانی پەیوەنـدی و ئەنجامدانی دان و ستان لە نێوان (دۆست و دۆست) و (دۆست و نـەیار)، تـاوەکو ئاکامێکی دروست و بە جێی لێ پەیدا ببێت.

پەیوەنـدی نێـوان (تـاك و تـاك) و ( تـاك و كۆمـەڵ) و ( تـاك و دەسـەلات)، پێویستی بـە شارەزایی زۆر هەیە،کە لـە کۆمـەلێك دەستور و بنـەمای زانستی پێــك هــاتووە،خۆ ئامــادەكردن بــۆ بــە ئــەنجام گەیانــدنی پەیوەندییــەكی سـەرکەوتوو، پێویسـتی بـە کەسـێکی زیـرەك و زانسـتێکی فـراوان و ناسـینی کەناڵــەکانی پەیوەنــدی هەیــە،گرنگی ئــەم هونــەرەش لــەم خاڵانــە خــۆی دەبینێتەوە.

١- هێنانـە کایـەی حاڵـەتێکی لێـك نزیـك بوونـەوە و پەیوەنـدی دوو قـۆڵی یاخود هەمەلایەنە.

٢- لە ئاکامی پەیوەندییەکان هەردوولا هەست بە تایبەت مەنـدی و بـوونی کەسایەتی پارێزرا و سەربەخۆی خۆی دەکات.

٣- گومانەکان دەرەوێنێتەوە و ئاژاوە و ململانێکان لەناو دەبات.

٤- نزیـك بوونــەوە روو دەدات و هێـز و توانـای هـەموو لایـەك بـەرەو یـەك ئامانج ئاراستە دەبێت.

٥- ئـارامی و ئاسـوودەیی دەروونـی دروسـت دەبێـت و سـەرکەوتن زووتـر بـە دەست دێت.

٦- ویست و خواستەکانی تاکەکانی کۆمەڵگا پارێزراو دەبێت.

٧- بەرگرتن لە کۆسپەکانی سەر رێگای سەرکەوتن و وەلانانی ناکۆکیەکان.

٨- پەیدابوونی کەسایەتی بەرزو کاریگەر.

٨- بوونەوەی دەرگای داهێنانکاری.

# کۆتایی باسەکە

نووسین لەبارەی بابەتێك لە بابەتەکان کارێکی ئاسان نیە و ماندوبوون و شەونخونیەکی زۆری دەوێت، بەتایبەتی ئەگەر بابەتەکە فراوان بێت و پەیوەندی بە رێژەیەکی زۆری خەڵکەوە هەبوو، بۆ لە دایکبوونی ئەم بابەتە ماندووبونێکی ئێجگار زۆرم چەشت، هەرچەندە باوەڕم هەیە کە سودێکی زۆری دەبێت، بەلاَم لەهەمان کاتیشدا سنوری زانیاری بێکۆتاییە و هەرگیز کۆتایی نایەت، دڵنیام ئەم بابەتە هێشتا تەواو نەبووە و تازە لە سەرەتایەتی، هیوادارم کەسانی دوای ئێمە پەرەی پێبدەن و زیاتر زانیاری لەسەر بخەنە روو، هەربۆیە ئەم باسە بێکەم و کورِی نازانم و هیوادارم خوێنەران بە گەورەیی خۆیان لە ناتەواویەکانم ببورن و بۆ راستکردنەوەی هەڵەکانم بەم ناو نیشانە ئاگادارم بکەنەوە.

Email: haedar_sean@yahoo.com (تەلەفۆن: ( ٠٧٥٠٤٩٩٣٨٧٠)

# سەرچاوەکان

سەرچاوە عەرەبیەکان:

١-استراتيجيات التدريس والتعليم، عبدالحميد جابر، طبعة الاولى، قاهرة، دار الفكر العربي، ١٩٩٩.

٢- الادارة و التخطيط التربوي للمفاهيم و الأسس، د. صلاح عبدالحميد مصطفى، امارات، دار القلم، (١٤٣٢ ) هيجري .

٣- حل المشكلات خطوة....خطوة، ريتشارد شانغ بي، ترجمة هناء العمري.

٤- طرائق التدريس العامة، توفيق احمد مرعي، دار الميسرة، طبعة الاولى، ٢٠٠٢.

٥- طرائق التدريس واستراتيجياته، محمد محمود الحلة، دار الكتاب الجامعي، طبعة الثاني، ٢٠٠٢.

٦- طرق و اساليب و استراتيجيات، احمد نجدي، دار الفكر، طبعة الاولى، ٢٠٠٣.

٧- التعليم الجماعي والفردي، ديفيد جونسون، ترجمة رفعت محمود، قاهرة، عالم الكتب، ١٩٩٨.

٨- الموهبة والتفكير الابداعي في التعليم، حسين عبدالحفيظ الكيلاني،عمان، دار الدجلة،طبعة الاولى،٢٠٠٩.

٩- ١٠٠ فكرة لإدارة سلوك الطلاب والطالبات، جوني ينغ، ترجمة سلام حسن الخطيب، مكتبة العبيكان عام ١٤٢٧.

١٠- منهج التربية الاسلامية، محمد قطب،

١١- تطوير العقلية العلاقاتية، من منشورات الاتحاد الاسلامى لطلبة

كردستان،رقم (٢) ١٩٩٧.

١٢- العلاقـات العامــة في العصــر النبــوة، د. مصــطفى دميرى،مكتبــة المنــارة، سعودية،طبعة الاولى، ١٩٨٨ز.

١٣- التغيير على منهاج النبوة، جمعة امين عبدالعزيز، اسكندرية، دار الـدعوة، طبعة الاولى، ١٩٩٥.

١٤- تعلـيم اللغــة حــالات و تعليقـات، دكتــور محمــد علــي الخــولي، الاردن، دار الفلاح،طبعة ١٩٩٨.

١٥- لغــة الجســم، محمــد عبــدالرحمن ابازيــد، عمــان، دار الخلــيج، طبعــة الاولى، ٢٠٠٤.

١٦- فلسفة الاخلاق في الاسلام، محمد جواد مغنية، دار العلم للملايين.

١٧- ج. كورتوا في كتابه "لمحات في فن القادة".

١٨- المصفى من صفات الدعاة، عبدالحميد البلالى، جزء الثـانى، طبعــة الرابعــة، ١٩٨٨

١٩- الشخصية المبدعة، هاني سليمان، دار الاسراء للنشر، اردن، طبعة الاولى، ٢٠٠٣.

٢٠- المناهج و طرائق التدريس، دكتور رحيم يـونس كـرو العـزاوي، عمـان، دار الدجلة،طبعة الاولى،.٢٠٠٩

٢١- كيف تكون معلما متميزا و ملقيا مؤثرا، د. محمد بن ديماس السويدى، دار ابن حزم، بيروت، لبنان، طبعة الاولى ٢٠٠٨.

## سەرچاوە کوردییەکان:

١- چەند وێستگەیەکی سایکۆلۆژی، یوسف عوسمان حەمەد، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئۆفسێتی تیشك.

٢- هونەری دیبلۆماسی و کاری پەیوەندییەکان، عبدوللا ئاگرین، هەولێر،چاپی یەکەم، ١٩٩٨.

٣- کۆسپەکانی رێ، سەیید محمد نوح، وەرگێرانی رزگار کریم، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، ١٩٩٨.

٤- چۆن منداڵەکەت پەروەردە دەکەیت، مسعود عوسمان شێخ وەسانی، چاپخانەی زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، چاپی یەکەم، ١٩٩٩.

٥- مەنهەجی رۆشنبیری قۆناغی یەکەم (١)، دانانی لیژنەیەکی پسپۆر،چاپی یەکەم، ٢٠٠٨.

٦- لە مەشقی پەروەردەیی دا، نووسینی مستەفا محمد تەحان، وەرگێرانی محسن جوامێر،چاپی یەکەم، ١٩٩٨.

٧- پەروەردەی دەروون، قۆناغی دووەم، ئامادەکردنی لیژنەیەکی پسپۆر، چاپی یەکەم ، ٢٠٠١.

## پێگەی ئەلکترۆنی:

١- www.islamhouse.com

٢- www.beet.com

٣- www.saaid.net

## پێرستی بابەتەکان


| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|
| پێشەکی | ٤ |
| پانزە بنەمای گرنگ بۆ هەڵسوکەوت لەگەل قوتابی | ٧ |
| بەشی یەکەم: لایەنە گرنگەکانی مامۆستای سەرکەوتوو | ١١ |
| لایەنی ڕەوشت | ١٢ |
| لایەنی پیشەیی | ٢١ |
| لایەنی ژیری | ٢٦ |
| لایەنی جەستەیی | ٢٨ |
| لایەنی کۆمەلأیەتی | ٢٩ |
| بەشی دووەم : مامۆستا و پۆل | ٣٣ |
| هەنگاوی یەکەم: پێداویستیەکانی پێش چوونە ژوورەوە | ٣٤ |
| هەنگاوی دووەم: قوتابیەکەت بناسە | ٤١ |
| هەنگاوی سێ یەم: هەڵسوکەوت لەگەڵ قوتابی | ٤٦ |
| هەنگاوی چوارەم: خاڵەکانی سەرکەوتن لە پۆل | ٥٠ |
| هەنگاوی پێنجەم: ڕووبەڕوو بوونەوەی کێشەکان و چارەکردنیان | ٥٦ |
| هەنگاوەکانی چارەسەری کێشە | ٥٨ |
| چەند هەنگاوێکی پێویست لەکاتی ڕووبەڕوو بوونەوەی کێشەدا | ٥٩ |
| هەندێك لەکێشانەی ڕووبەڕووی مامۆستا دەبێتەوە | ٦٠ |
| هەنگاوی شەشەم: سزا و پاداشت | ٦٧ |
| بەشی سێ یەم : پێداویستیەکانی مامۆستای سەرکەوتوو | ٧٣ |
| هەبوونی پلانی ساڵانە و مانگانە و ڕۆژانە | ٧٣ |
| خوێندنەوە و خۆ ڕۆشنبیرکردنی بەردەوام | ٧٥ |

| | |
|---|---|
| ناسین و شارەزایی لە قۆناغی هەرزەکاری | ٨٠ |
| شارەزایی لە هونەری سەرکردایەتی | ٨٢ |
| هونەری مامەڵەکردن لەگەڵ بەرامبەر | ٨٣ |
| شارەزایی لە ڕێگاکانی وانە گوتنەوە | ٨٨ |
| هونەری دەربڕین | ٩٢ |
| هونەری پەیوەندیەکان | ٩٤ |
| کۆتایی باسەکە | ٩٦ |
| سەرچاوەکان | ٩٧ |